# واتاسازی

## چەند لێکۆڵینەوەیەکی سیمانتیکی و پراگماتیکییە

پ.ی.د. عەبدولواحد مشیر دزەیی





## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

# ● واتاسازی

## چەند لێکۆڵینەوەیەکی سیمانتیکی و پراگماتیکییە


● نووسینی: پ.ی.د. عەبدولواحید مشیر دزەیی

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● بەرگ: ئاسۆ مامزادە

● ژمارەی سپاردن: ٩٤١

● نرخ: ٢٠٠٠ دینار

● چاپی یەکەم ٢٠٠٩

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی خانی (هەولێر)

زنجیرەی کتێب (٤١٥)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**زاراوە پێویستەکان:**

| ئینگلیزی | کوردی |
|---|---|
| Conversation | ئاخاوتن |
| Deep structure | ئاستی ژێرەوە |
| Surface structure | ئاستی سەرەوە |
| Intonation | ئاوازی رستە |
| Idiom | ئیدیەم |
| Restructure | بنیات نانەوە |
| competence | توانست |
| Back round | پاشخان |
| Sense relation | پەیوەندی چەمکی |
| Projection-Rules | پرۆژەسازدان |
| Presupposition | پێش گریمانە |
| Conversation Structure | پێکهاتی ئاخاوتن |
| Syntactic Structures | پێکهاتی سینتاکسی |
| Categorical Component | پێکهێنەری پۆلی |
| Relevance | پێوەندی (گونجان) |
| Adjacency pairs | جووتە گوتن |

| | |
|---|---|
| Hyponymy | داپۆشین |
| Semantic unit | دانەی واتایی |
| Expressive | دەربڕین |
| Contradiction | دەربڕینەدژەکان |
| Implicature | دەرکەوتەکان |
| Entry | دەروازە |
| Text | دەق |
| Contexts | دەوروبەر |
| Context of situation | دەوروبەری بار |
| Emotional Context | دەوروبەری دەروونی |
| Context of Culture | دەوروبەری رۆشنبیری |
| Linguistic Context | دەوروبەری زمانی |
| Converse ness | دژواتای پێچەوانە |
| Sautology | دووبارەکردنەوەی هەمان واتا |
| Conversation structure | رۆنانی ئاخاوتن |
| Analysis | راڤەکردن |
| Sociological Linguistics | زمانەوانی کۆمەڵایەتی |
| Overstate | زیادەرۆیی |
| Meaning fullness | سوودمەندی |

| | |
|---|---|
| Connotative Meaning | سێبەری واتایی |
| Generative Semantics | سیمانتیکی بەرهەمهێنان |
| Semantic differentiation | جیاکەرەوەی سیمانتیکی |
| Conversation analysis | شیکردنەوەی ئاخاوتن |
| Manner | شێواز |
| Quality | چۆنییەتی |
| Pragmatic Competence | چالاکی |
| Concept | چەمك |
| Quantity | چەندێتی |
| Transferee | گواستنەوە |
| Utterance | گوتن |
| Affix | گیردك |
| Lexicon | فەرهەنگ |
| Polysemy | فرەواتا |
| Selection restrictions | کۆتی هەڵاویرکردن |
| Speech acts | کردە قسەییەکان |
| Deviation | لادان |
| Ambiguity | لێڵی |
| Intension | مەبەست |

| | |
|---|---|
| Turn-taking | نۆبەگرتن |
| Redundancy | ناوەخنکردن |
| Content | ناوەرۆك |
| distinguishers | نیشانە جیاکەرەوە |
| Grammatical marker | نیشانەی ڕێزمانی |
| Semantic marker | نیشانەی سیمانتیکی |
| Deixis | نیشانکارەکان |
| Homophone | هاوبێژ |
| Metaphor | هاودڵواتا (میتافۆر) |
| Synonymy | هاوواتا |
| Collocation meaning | واتای هاورێیەتی |
| Cover word | وشە داپۆشەر |
| Transformational rules | یاساکانی گوێزانەوە |

هێما سیمانتیکییەکان:

{ } کەوانەی نیشانە ڕێزمانییەکان.

< > کەوانەی نیشانە سیمانتیکییەکان.

[ ] کەوانەی نیشانە جیاکەرەوەکان.

؟ نیشانەی ڕستەی ناوێزە

# ناوەڕۆك

تەوەرەی دووەم: لایەنی پراکتیکی

## پێشەکی:

هەر لە سەردەمی ئەفلاتوون و ئەرستۆوە دوو ناست بۆ زمان جیاکرابووە(دەنگ و واتا)، بەڵام تا ماوەکی زۆر واتا فەرامۆش کرابوو، لێی نەدەکۆڵدرایەوە، چونکە پەیوەندی بە جیهانی دەرەوە هەبوو، بەڕای ئەمان زمانەوان تەنها بەرپرسیارە لە نێوان (بیر) و (هێما)، بەڵام تەمن دەکەوێتە دەرەوەی کایەی زمانەوانی و دەچێتە ناو فەلسەفە و مەنتق و دەروونناسی .. هتد هەربۆیەش پێشتر هەموو هەوڵێکی زمانەوانەکان بۆ شیکردنەوەی لایەنی روخسار بوو بێ گوێدانە واتا، بەڵام لایەنگرانی قوتابخانەی ڕێزمانی گواستنەوەی وەك: چۆمسکی و فلیمۆر...هتد دەریان خست، کە واتا کاریگەرییەکی زۆری هەیە بەسەر پێکهاتی رستەسازی.

لێکۆڵینەوەکانی واتاسازی لای رۆژئاواییەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دەرکەوت . وشەی سیمانتیك سەرەتا لەلای زمانەوانی فەرەنسی (میشێل برێل – Michel Breal ) بەکارهات لە ساڵی ١٨٨٣ کە وشەی ( سیما - Sema) یان نیشانەی یۆنانی داتاشراوە دواتریش ساڵی ١٨٩٤ باسێك بۆ کۆمەڵەی زمانەوانانی ئەمەریکایی پێشکەش کرا لە ژێر سەردێری (واتا پێچەوانەکان) لە هەردوو حاڵەتدا وشەکە تەنها ناماژە نەبوو بۆ واتا، بەڵکو بۆ مێژووی واتا بوو. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٠٠ بە زمانی ئینگلیزی پەرتووکێك دەرچوو لە ژێر ناوی (سیمانتیکس)، لێکۆڵینەوە لە زانستی واتا پێش ئەم مێژووەش بەسێ ساڵ دانە رەسەنەکەی بە زمانی فەرەنسی دەرچوو بوو. ئەم پەرتووکە تیایدا روون کراوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی تایبەت نییە بە گۆڕانی واتا لەلایەنی مێژوویییەوە، بەڵام وشەی سیمانتیك بۆ ماوەیەك بڵاو نەبووە. ئەمە بوو ساڵی ١٩٢٣ پەرتووکێك دەرچوو لە ژێر ناوی (واتای واتا – *The Meaning* of *the Meaning* ) کە دانەرەکەی ( ئۆگدن و ریچاردس *Ogden & Richards* ) بوون. هەرچەندە ئەم کتێبە ناوی وشەی سیمانتیکی تیادا نەهاتووە، بەڵام کتێبەکە باس لە کێشەی واتا دەکات لە زمانە سەرەتاییەکاندا. دوای ئەمە لێکۆڵینەوە لەم بوارەدا پەرەی سەند تا

وای لێهات بوو بەیەکێکە لە لقە گرنگە سەرەکییەکانی زمان . لێکۆڵینەوە لە بواری واتاسازی پەرەی سەند تا ئەوکاتەی ئاستێکی تری واتا دەرکەوت کە ئەویش پراگماتیکە بەمەش ئەرکی سیمانتیک کەم بۆوە .

زاراوەی پرگماتیك بۆ یەکەمجار لە ساڵی١٩٣٨ لە لایەن چارڵس مۆریس، لە کتێبەکەیدا بە ناوی هێمالۆجی *Semiotics* بەکارهاتووە، کە زمانەوانی دەکاتە سێ بەش: (ڕستەسازی و واتاسازی و پراگماتیك) کە بریتییە لە: (پەیوەندی واتا بە دەوروبەرەوە و لێکۆڵینەوەی دەروون و کۆمەڵیش دەبنە بەشێك تێیدا).

سەرەتا پراگماتیك لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك مەزهەبێکی فەلسەفی پەرەی سەند. دواتریش وەك بوارێکی گرنگی زمانەوانی دەرکەوت گرنگی بە زمان دەدات لە کاتی بەکار هێنانی دەماودەمیدا، و لەو بنەمایانەش دەکۆڵێتەوە کە کاریگەری لەسەر زمان هەیە و لەگەڵ کۆمەڵگا کار لێك دەکەن.

ئەم زانستە بەشێکی زۆر کەمی لە ناو لێکۆڵینەوە زانستییەکانی زمان بۆ تەرخان کراوە، تەنها لەم ساڵانەی دواییدا گرنگی پێ درا کاتێك هەندێ کێشە سەریهەڵدا کە ڕستەسازی و واتاسازی نەیان توانی چارەی بکەن، تەنهاش بەوە چارە دەکرا کە دەوروبەر لە بەر چاو بگیرێت.

ئەم پەرتووکە چەند باسێکی زانستی لە خۆوە دەگرێت لە سنووری سیمانتیك و پراگماتیکدا بەو هیوایەی زیاتر خوێنەرانی ئازیز سوودی لێببینن و کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ بکاتەوە و ببێتە مایەی ئاساندنی ئاستی واتا بە خوێنەران.

**سەرەتا:**

واتای سیمانتیکی و پراگماتیکی دوو ئاستی واتان و تەواوکەری یەکترین و پەیوەندییان بە تێگەیشتن و لێکدانەوە و کردنەوەی هێماوە هەیە، ئەم هاوبەشیانە ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم دوو ئاستە یەکبن، بەڵکو جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەم دوو ئاستەی واتادا هەیە، هەریەکەیان لە روانگە و گۆشەیەکەوە دەروانێتە واتا و ئەو کێشانەی سیمانتیک چارەسەریان ناکات پراگماتیک چارەسەریان دەکات و لێکدانەوەی گونجاو بۆ تەمومژە واتاییەکانی سیمانتیک دەدۆزێتەوە.

تا ئێستا لێکدانەوەیەکی سەربەخۆ و ورد بۆ جیاکردنەوەی ئەم دوو ئاستەی واتا نەکراوە بۆیە ئێمەش هەوڵدەدەین لە دووتوێی ئەم باسەدا (واتا لە نێوان سیمانتیک و پراگماتیکدا) ئەم دوو ئاستە لەیەك جیا بکەینەوە، خاڵە ناوکۆ و جیاوازەکان بخەینەڕوو، لە ژێر رۆشنایی رێبازی ئەرکی شیکاری بەراورد.

## ١. ئاستەکانی واتا

بۆ یەکەمجار لە ساڵی(١٩٣٨) (چارڵس مۆریس)، لە کتێبەکەی دا بە ناوی هێمالۆجی (*(Semiotics*) زمانەوانی کردبووە سێ ئاست : (سینتاکس و سیمانتیك و پراگماتیك):

١. (سینتاکس) پەیوەندی هێمایە لەگەڵ هێما.

٢. (سیمانتیك) پەیوەندی هێمایە لەگەڵ تەن لە دەرەوەدا.

٣. (پراگماتیك) پەیوەندی هێمایە بە بەکارهێنەر.[1]

ئەوەی پەیوەندی بە ئاستی واتاوە هەبێت هەردوو ئاستی (سیمانتیك و پراگماتیك)ە، کە تایبەتن بە لێکدانەوەی رووی ناوەوەی هێما:




(کارناب) دوای ساڵێك لە دابەشکردنەکەی هێما لای (مۆریس)(پراگماتیك)ی وا لێکدایەوە کە بوارێکی لێکۆڵینەوەیە و رەچاوی چالاکی مرۆڤ دەکات کاتێ کە قسە دەکات یان گوێی لە هێمایەکی زمانی دەبێت لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی کە گوتنەکەی تیا ئەنجام دەدرێت. بەمەش پراگماتیك دەبێتە پەیوەندی نێوان زمان و دەوروبەر.

(أ.ج.حبیب) بەوە سیمانتیك و پراگماتیك لە یەك جیادەکاتەوە کە:

سیمانتیك: بەستنەوەی هێمایە بە شتەکانی دەوروبەری.

پراگماتیك: پەیوەندی نێوان هێماو بەکارهێنەرەکەی.

جا لێرەدا ئەگەر پەیوەندی نێوان ئەم دوو بوارەی واتا لە گۆشەنیگای پەیوەندی بە تێگەیشتن و مەبەستی قسەکەران بێت ئەوا پەیوەندی نێوانیان تەواوکەری دەبێت، چونکە هیچ یەکێکیان بێی ئەویتر ناتوانێت ببێتە سەرچاوەی واتا.

## ٢. بنەماکانی واتا

واتا لێکدانەوەی دیوی ناوەوەی هێمایە و ئەو کۆمەڵە وێنە هۆشەکییەیە کە بە وشە یان گوتن دەنوێنرێت [٢] و بنەماکانی بە پێی جۆرەکانی دەگۆرێت:

واتای سیمانتیکی لەسەر دوو بنەما بەندە:

١. هێما: زنجیرە دەنگێکی رێکخراوە و وشە پێکدێنێ.

٢. دیاردە: شتی دەرەوە کە تەن و شت و رووداو و کەس دەگرێتەوە.

سیمانتیك خەریکی لێکدانەوەی واتایە لە چوارچێوەی پەیوەندی هێما بە تەنەکە و ئایا پەیوەندییەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە رێگای (بیر)ەوە بەیەکەوە

دەبەســترێنەوەو سروشــتی شــتەکەی کــە لــەناو مێــشکدا بەرامبــەری دەوەســتێت کێشەیەکی ترە بۆ سیمانتیك ئایا (وێنە، چەمك، بۆچوون)ە.

کەواتە سیمانتیك لێکدانەوەی هێمایــە لــە چوارچێیوەی واتــا باوەکــەی لــە نــاو کۆمەڵ.

واتای پراگماتیکی لێکدانەوەی گوتنــە لــە روانگــەی بەکارهێنــەری هێماکــە و لەسەر چوار بنەما بەندە: (قســەکەر، گــوێگر، بابــەت، دەوروبــەر) کــە هەریــەك لــە بنەماکان گۆڕانی بەسەربێت ئەوا واتاکەشی دەگۆڕێت [3].

١. قسەکەر

ئەو کەسەیە کە پەیامەکە بــە مەبەســتێك و لــە بــارودۆخ و کــات و شــوێنێکدا بەرەچاوکردنی یاسا رێزمانی و واتاییەکان دەنێرێت، کە بەزۆری لەسەر بنەمای گریمانە بنیات دەنرێت..

٢. گوێگر

ئەو کەسەیە کە پەیامەکە وەردەگرێت، لە مێشکیدا شێیاندەکاتەوە، کاتێکیش سەرکەوتوو دەبێت ئەگەر ئاگــای لــە بارودۆخەکــە بێــت و لــە مەبەســتی (قســەکەر) بگات.

٣. بابەت

ئەو بیرەیە کە (نێرەر) دروستی دەکات، پاشــان وەری دەگێڕێتــە ســەر هێمایــەکی گونجاو، تا بەرامبەرەکەی تێیبگات.

٤. دەوروبەر

هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە کاریگەریان لەسەر ئاخاوتن هەیە [4]. قسەکەر کــاتێ قســەیەك دەکــات ئــەو قســەکردنە بــە دەوروبــەرو بــارودۆخێکی تایبــەت بەستراوەتەوە و کایگەریان لەسەر واتای پراگماتیکیدا هەیە.

**٣- تواناني هێما:**

هێما چەند دەنگێکە شتێك دەنوێنێ، کە خۆیان نین و مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی هێما بۆ شتێك دادەنێت، تاکو ژیانی ڕۆژانەی ڕێکبخات و کەسەکان لە یەکتر بگەن[٥].

هێما لە سیمانتیکدا پەیوەندییەی هەیە لەگەڵ دنیای دەرەوەدا. گرنگ ئەوە نییە ئایا هێماکە لە چ کەسێکەوە بۆ چ کەسێك بەکارهاتووە بە چ مەبەستێك بەکارهاتووە، بەڵکو بەو واتایە بەکاردێت کە ڕێکەوتنی خەڵکی لەسەرە.

(هێما) بەرامبەر بە (تەن، ڕووداو، شت، کەس) دەوەستێت، لە ڕێگای پەیوەندییەکی ناڕاستەوخۆی لەگەڵ (بیر) دا وەك:




بەمەش لێکدانەوەی سیمانتیك دەبێتە لێکدانەوەی هێما زمانییەکان لە چوارچێوەی واتا ئاسایی و بڵاوەکەی لە ناو کۆمەڵ.

هێما لە ئاستی پراگماتیکدا پەیوەندییەکی چوار قوڵی دروست دەکات لە نێوان (هێما، تەن، بیر، کەس) بەمەش لێکدانەوەی واتایی لە ڕوانگەی (کەس)ەوە دەبێت پەیوەندیە ئاساییەکەی کە لە نێوان (هێما) و (تەن) هەیە دەپچڕێت لێکدانەوەکە بە پێی (قسەکەر، گوێگر، دەوروبەر) [٦] دەگۆڕێت، کەواتە هێما لەم ئاستەدا واتایەکی جێگیری نییە و لە گۆڕاندایە.

هێما

تەن

بیر

کەس

بەستنەوەی هێما بە دەوروبەرەوە لە واتا سیمانتیکییەکی ناماپچڕێنێ، بەڵکو هێما سیمانتیکییە کە دەمانگەیەنێتە مەبەست و چونکە واتا راستەقینەکەی لە پاڵ شادراوەتەوەو لە ڕێگای بەستنەوەی واتا بە دەوروبەرەوە دەیگەینێ بۆیە دەتوانین بڵێین واتای وشە بریتییە لە ژمارەی بەکارهێنانەکانی [٢].

بۆ نموونە وشەی (خوارد) لەم رستانەی خوارەوە واتاکەی گۆڕاوە:

- سەهەند نانەکەی خوارد (نان خواردن).
- سەهەند سوێندی خوارد (سوێند خواردن).
- سەهەند غەمی خوارد (غەمخواردن).
- سەهەند ڕۆژووەکەی خوارد (بەڕۆژوو نەبوون).
- سەهەند پارەکەی خوارد (پارە خەرجکردن).
- سەهەند جگەرەکەی خوارد (جگەرەکێشان).

وشەی (خوارد) لە هەریەك لەم بەکارهێنانەی خوارەوە واتاکەی جیاوازە، چونکە بەرکارە کە گۆڕدراوە، بۆیە هێما لەم بوارەدا لە ڕوانگەی بەکارهێنەرەکەی لێکدەدرێتەوە نە واتا بڵاوەکەی کە کارێکی تێپەڕەو دووهاو بەشی دەوێ (بکەر) و(بەرکار).




هێما لە بواری پراگماتیکدا هەردوو جۆرەکەی دەگرێتەوە، هێمای زمانی و نازمانی چونکە زۆرجار هێما نازمانییەکان واتا سیمانتیکییەکان پێچەوانە دەکەنەوە، هەروەك (دافید ابروکرومبی) دەڵێت: ئێمە بە هەموو ئەندامانی لەشمان قسە دەکەین[8]، بۆ نموونە کاتێ بە(چاوتروکاندن)ێکەوە و بە ئامادەبوونی کچەکە و چەند کەسانێکیتر و بە بیناگایی کچەکە پێی بڵێی:

- زۆرجوانی!

ئەمە واتاکەی پێچەوانە دەکاتەوەو دەبێتە توانج بۆی و ئەگەر ئاگاشی لێبێت ئەوا توورە دەبێت.

## 4- واتا و دەوروبەر

دەوروبەر چەمکێکی فراوانەو هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە کاریگەریان لەسەر زمان هەیە لە ئێستاو رابردوو، لە هەر دەوروبەرێکدا بێت ئەوا جۆرە واتایەك دەدات، دەوروبەر گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ لێکدانەوەی واتا هەروەك (لاینز) دەڵێت: ئەو دەوروبەرە بدۆ کە وشەکەی تێدا بەکارهاتووە واتاکەت دەدەمێ [9] دەوروبەر تاکە رێگایە واتای فەرهەنگی واتای مەبەستمان بۆ روونەکاتەوە[10]، بەڵام لە ئاستی سیمانتیکدا دەوروبەر پشتگوێ دەخرێت، هەربۆیەش واتای سیمانتیکی تەمومژی لێدەکەوێتەوە، و (چۆمسکی)یش یەکەم کەس بوو دەیگوت رستە بۆ ئەوەی بە کەلکی لێکۆڵینەوە بێت، دەبێت بکرێتە شتێکی نموونەیی و لە دەوروبەر بکرێتەوە، چونکە

بەستنەوەی وشە بە دەوروبەر چەندین واتای جیاوازی لێدەکەوێتەوە [11]. کە لە فەرهەنگدا نییەتی.

دەوروبەر خاڵێکی گرنگی جیاکەرەوەیە لە نێوان سیمانتیك و پراگماتیکدا واتای پراگماتیکیش بریتییە لە (واتای سیمانتیکی + دەوروبەر) جا ئەگەر واتای سیمانتیکی بە دەوروبەر ببەستینەوە ئەو کاتە واتای وشە کۆتایی نایێ، بۆ نموونە ناتوانین بڵێین هەردوو وشەی (باش) و (خراپ) هاوواتان لە فەرهەنگدا کاتێ لە دەوروبەردا هەمان واتا بدات:

- لێدانێکی باش ی لێدا
- لێدانێکی خراپ ی لێدا [12].

دەوروبەر لە سێ خاڵ لەنگەر دەگرێ:

### ١. کەلتووری

کە پەیوەندی نێوان قسەکەران دەگرێتەوە لە بیروباوەڕ و هەست و رەوشت و خو و.....هتد کە یارمەتیدەر دەبێت بۆ تێگەیشتنی رستەیەکی وەك:

- ئەو هەتیوە نامەردە هەر نەهات.

لێرەدا بەشداربووان دەزانن قسەکەر مەبەستی کێیە و تێیدەگەن، بەڵام کەسێکیتر تێناگات.

### ٢. دەوروبەری باری

ئەو بارودۆخە دەگرێتەوە کە قسەکەی تێدا دەکرێت ئەو نیشانانەش لێکدەداتەوە کە واتاکەی ڕوونئەکاتەوە، بۆ نموونە:

- بەیانیت باش.

وا باوە لە ناو کۆمەڵ کە سڵاو بێت، بەڵام زۆر جار بۆ توانج بەکاردێت دوای بێئاگاییەك. ئەمەش چەند تەوەرەیەك دەگرێتەوە.

أ- شێوەی دانیشتن:

شێوەی دانیشتن کاردەکاتە سەر قسەکردن و هەستی بەرامبەر هەر بۆیە دەبینین لە دانیشتنە رامیاریەکاندا لایەنی ناکۆك لەسەر مێزێکی بازنەیی دادەنیشن، و واتای ئەوە دەدات کە کەسیان لەویتر بە دەسەڵاتتر نییە.

ب- دۆخ:

ئەو بارە دەگرێتەوە کە قسەکەی تێدا دەکرێت، بۆ نموونە کاتێك دەگوترێت:

- چێشتەکە سوێرە.

ئەم رستەیە دەبێتە ترخاندن و نارەزایی لەو کەسەی کە چێشتەکەی لێناوە.

جگە لەمەش هێز و ئاواز و وەستان زۆربەی واتاکان دەگۆرن.وەك:

(١) بەسەبری (بە هێواشی)

(٢) بەسەبری (تۆ سەبرت هەیە).

(٣) بەسەبری (بە کەسێك ناوی سەبریە)

یان رستەیەکی وەك (هات) بە پێی گۆرینی ئاوازی دەنگمان هەر جارەی واتایەك بەدەستەوە دەدات وەك:

١. هات؟

٢. هات!

٣. هات.

وەستانیش لە گۆکردن بەهەمان شێوە کار لە هێما دەکات و واتا دەگۆرێت وەك:

١. ماڵت ئاوەدان. نەبی (نەبی) وەك ناوی کەس.

٢. ماڵت ئاوەدانەنەبی (نەبی) وەك نەرتی بوون.

ج- کات و شوێن:

کاتی قسەکردن گرنگی زۆری هەیە بۆ واتا، بۆ نموونە ئەگەر لە شوێنێکی سەرتاشین نووسرابێت:

● دوای کاتژمێرێکیتر دێمەوە.

ئەوا واتاکەی دیاری ناکرێت تاکو کاتی قسەکردنە کە نەزاندرێ.

شوێنیش بەهەمان شێوە واتا دیاردەکات، بۆ نموونە:

● دوێنێ لە کوێت بووم.

ئەوە دەگەیەنێت کە لە (شاری کوێت) بووە یان (دەوڵەتی کوێت) بووە جا ئەگەر شوێنی قسەکردنەکە بزانین ئەوا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە لە کوێ بووە، بۆ نموونە با شوێنی قسەکردنە کە (ئەحمەدی)ی بێت ئەوا دەزانین کە لە (شاری کوێت) بووە و ئەگەر شوێنی قسەکردنەکەش گرمانە (عێراق) بوو ئەوا مەبەستی (دەوڵەتی کوێت)ە.

د- شتی پەیوەندیدار:

ئەو شت و ڕووداوانەی کە پەیوەندیان بە قسەکردنەوە هەیە واتا دەگۆڕن وەك:

● باڵابەرز وەرە.

ئەم ڕستەیە توانج دەگرێتەوە ئەگەر کەسەکە باڵای کورت بێت.

هـ- پەیوەندی نێوان قسەکەران:

پەیوەنی نێوان قسەکەران هاوکێشەی واتای دەگۆڕێت، بۆ نموونە:

● دەرگاکە بکەرەوە.

بە پێی پەیوەندی نێوان قسەکەران واتاکەی دەگۆڕێت. ئەگەر لە خاوەنماڵێك بێت بۆ خزمەتکارەکەی ئەوا دەبێتە (فەرماندان) و ئەگەر لە نێوان دوو هاوڕێ بێت ئەوا دەبێتە داخوازی.

### ٣. پەرەزمانییەکان:

لە پراگماتیکدا ئەو پێرەو و هێمایانەش لێکدەدرێتەوە کە شتێك دەربارەی قسەکەر دەردەخات، وەك: (لێوقوچاندن و چاو تروکاندن و لە چ بارێکی دەروونیدا دەژی و، هەروەها، باری دەم و چاوی چۆنە؟...هتد). بۆ نموونە:

ئەگەر بە لێو گەستنێکەوە بە ئامادەبوونی کەسی دووەم بە کەسی سێیەم بگوترێت:

● باشە لەگەڵت دێم.

ئەوا واتاکە پێچەوانە دەکاتەوە واتای ئەچوون دەدات [١٣].

## ٥- واتای روون و شاراوە

هەموو ئەو رستە و گوتنانەی کە رۆژانە بەسەر زاری خەڵکەوەن لە دوو روانگەی واتاییەوە خۆی دەبینێتەوە:

### ١. واتای روون (چەمکی):

ئەو واتایە دەگرێتەوە کە لە واتای فەرهەنگی وشەکان و ریزکردنیانەوە دێتەکایەوە، لە شێوەی سیمای جیاکەرەوە خۆی دەنوێنێ، وەك:




واتای ریزکردنیش کە کاریگەری ریزمانی دەگرێتەوە، بریتییە لە شوێنی وشەکە لە رستە [١٤]. وەك:

● رزگار رۆزای دیت.

● رۆزا رزگاری دیت.

ئەم دوو رستەیە هەرچەندە لە ژمارەی وشەکان یەکسانن، بەڵام واتایان جیاوازە، چونکە ریزکردنیان جیاوازە.

ئەگەر وشە و رستە بە مەبەستی گەیاندن بەکاربهێندرێت، دەبێ ئەو واتایە بە شێوەیەکی راستەوخۆ و بێ پێچ و پەنا بخرێتەروو و مەبەست بە ئاشکرایی و بەویژدان

و به ڕێزەوە دەربردرێت، واتە چی سەرزاری گوتراوە هەر ئەوەش مەبەستە. جا جۆری ڕستەکە هەر چیەك بێت. تەنها ئەو مەبەستە دەگەیەنێت کە بە ڕاشکاوی گوتراوە و لە چوارچێوەی ڕستەکە دەرناچێت. بۆ نموونە:

- یارا بە یەکەم دەرچوو.

ئەم ڕستەیە دەبێت تەنها مەبەست هەواڵدانبێت نەك توانج و پلار و.....هتد

## ٢. واتای شاراوە (کارەکی):

ئەو واتا شاراوەیە دەگرێتەوە کە لە پاڵ گوتنەکەدا دەکرێت و مەبەست بە شاراوەیی و ناڕاستەوخۆی دەخرێتەڕوو و بە پێی دەوروبەر لە گۆڕاندایە و مەبەست و گوتنی زارەکی یەکناگرنەوە، جا لەبەر هەر هۆیەك بێت ( ڕێزگرتن، ترس، شەرم، دڵنەرەنجاندن...هتد). بۆ نموونە ئافرەت لە ژێر کاریگەری ئەو بارە کۆمەڵایەتییەی تێیدا دەژی هەرگیز نایەوێ بیری خۆی بەزەقی و ئازادی دەربڕێ خۆی بەرامبەر بە پیاو لێپرسراو بکات بۆیە ئاستی سەرەوەو ژێرەوەی ڕستەکانیان وەك یەك نییە. وەك:

- سەعات چوار یەی بە شوێنما بۆ ماڵی باوکم؟

ئەم ڕستەیە هەرچەندە زارەکی لە شێوەی پرسیارە، بەڵام لە کرۆکدا مەبەستێکی شاراوە هەیە کە داخوازی ئافرەتەکەیە و ئارەزوو دەکات بە شوێنیدابچێت و بیهێنێتەوە دیاریکردنی (سەعات چوار)یش هەر بۆ ئەو مەبەستەیە [١٤].

بەکارهێنانی زمان زۆر جار بۆ ئاماژێکە لەگەڵ واتا فەرهەنگییەکەی یەکناگرێتەوە وەك ئەوەی هەندێجار بە مەبەستی ڕازیکردن یان کاریگەری کردنەسەر بیروباوەڕ یان سەرلێشێواندن بەکاردێت [١٦].

**٦- خوێندنەوەی هێما و نیشانە**

لێکدانەوەی (واتا) پشت بە دوو بنەما دەبەستێت:

**أ- واتای فەرهەنگی و دیار**

**ب- واتای دەوروبەر کە بە واتای مەبەست ناودەبرێ[١٧].**

ئەم ئەوەرەیە دەکەوێتە سەر (وەرگر) لەسەریەتی پەیامەکە بەم سێ قۆناغە لێکبداتەوە[١٨]:

١- لێکدانەوەی واتای دەربڕاو، لە ڕێگای واتای وشە و لێکدانیانەوە.

٢- بەراوردکردنی واتا دەربڕاوەکە لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی کە تیایدا گوتراوە، تا بزانێت دەگونجێت یان نا.

٣-ئەگەر مەبەستەکەی نەگەیاند، ئەوا دەبێ بگەڕێتەوە بۆ هەندێ زانیاری کەسی و کەلتووری و دەوروبەر.

خوێندنەوەی هێما لە خاڵی یەکەمەوە دەستپێدەکات و ئەرکی (سیمانتیک)ە، چونکە (گوێگر) پێشبینی ئەوە ناکات کە قسەکەر بنەمای هاریکاری نێوان (قسەکەر) و (گوێگر) بپچڕێنێ بۆیە سەرەتا هێما دەربڕاوەکان دەخوێنێتەوە واتا ناسایی و فەرهەنگییەکانیان لێکدەداتەوە لە ڕێگای واتای وشە و کاریگەری ڕێزمانی و شوێنی وشەکە لە ڕستەدا.

کاتێ دەربڕینێك پەیوەندی بە واتای کەرتە پێکهێنەرەکانییەوە نەبوو[١٩]، و لەگەڵ دەوروبەردا نەگونجا و (گوێگر) دڵنیابوو کە بەراستییەتی و(قسەکەر) نە شێتە و نە شاعیر، ئەو کاتە هێماکان دەبێت لێکدانەوەیەکی (پراگماتیك)ی قووڵی بۆ بکرێ و بەمەش (گوێگر) ئەرکی قورس دەبێت و پێویستی بە چالاکی دەبێت تاکو لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ دەوروبەری گوتنە ناپەسندەکان بدۆزێتەوە بۆیە لەسەریەتی مێشکی (قسەکەر) بخوێنێتەوە و گریمانە بۆ زۆرشت بکات بۆ ئەوەی مەبەستەکەی بۆ روون بێتەوە، ئەمەش پێویستی بە دەوروبەر و زانیاری کەسی دنیایی دەبێ تاکو مەبەست بەنزیکراوەیی یان تەواوی لێکبداتەوە، بۆ نموونە ناخاوتنێکی وەك:

أ. ............ ئێستا چۆنە؟
ب. وا جووت دەكات.
ت. (پێدەكەنێت).

لەم دەقەدا دەبێت مێشكی (قسەكەر) بخرێندرێتەوە بۆ ئەوەی بزاندرێت مەبەست چییە چونكە واتاكان لە رێگای هێماكان لێكنادرێتەوە، چونكە كەسی سێیەم پێدەكەنێت، كەواتە دەوروبەرەكە (لادێ) نییە، چونكە شتێكی ئاساییە جووتكردن لە لادێ، جا دەوروبەرە كە هەر شوێنێك بێت، چونكە لادێ نییە ئەوا نائاساییە و نائاساییەكەش لەوەدایە كاری جووتكردن لەگەڵ (كەر) بەیەكەوە دێن. هەموو سیفەتی(كەر) دەدرێتە پاڵ كەسەكە لێرەشدا پێكەنینەكەی كەسی سێیەم ئاسایی دەبێت.

## ٧- پاسا و بنەما

زمان بەشێكە لە باری كۆمەلآیەتی (قسەكەر) و یاساكانی بە كەلتوور و زمانەوانی كارەكی بەندە كە یاسا فۆنۆلۆجی و رێزمانی و واتایەكان و پێرەوی گەیاندن و توانای بەكارهێنانی زمان وەك تاكێكی كۆمەڵ دەگرێتەوە، كە تاك لە لە كۆمەڵگادا فێری دەبێت پێش ئەوەی قسەی پێبكات، بۆ نموونە: زانینی كاتی لە بار بۆ دەست پێكردنی گفتوگۆ و هەڵبژاردنی بابەتی گونجاو بۆ بۆنە و رووداوێكی تایبەتی و، چۆنیەتی بانگكردنی خەلكی.....هتد، جا ئەگەر لە ناو نەتەوەیەكدا نەژین لە زۆر گفتوگۆ و هەڵسوكەوت ناگەین، ئەگەر سەر بەیەك نەتەوەو زمانیش بین، چونكە زمان رەنگدانەوەی ئەو بارە كۆمەلآیەتییەیە كە قسەكەرانی تێدا دەژین، بۆ نموونە هەندێ وشەی وەك: (مسكێن، رەنجەدەر، مەیتەر...هتد) كە لە دەرەوەی پێرەوی كۆمەلآیەتی كوردی نەبێت واتایان لێكنادرێتەوە[٢٠] مەبەستیشمان لە بنەما، بنەمای هاریكارییە كە (چەندێتی، چۆنیەتی و گونجان و شێواز) دەگرێتەوە، كاتێك (قسەكەر) و (گوێگر) دەچنە ناو ناخاوتنەوە باوەڕیان وایە دەچنە ناو چالاكی هاوبەشەوە، و نەخشەكێشانێكە بۆ ئەوەی ناخاوتن شێوەی نموونەیی وەربگرێ و وەك پێویست

بێت[٢١]. واتای سیمانتیکی وەك تەركێكی كۆمەڵایەتی (قسەكەر) لەسەریەتی هەموو ئەو یاسا و بنەمایانە پیادە بكات كە باوە و كۆمەڵ ڕێپێداوە بە مەبەستی گەیاندن، بۆ نموونە كاتێك پیاوێك بە ژنەكەی بڵێت:

- تۆم تەڵاق دا

ئەوا بە پێی شەرع و یاسا ئەو پیاوە تەڵاقی كەوتووە و ژنەكەش تەڵاق دراوە[٢٢].

پراگماتیك لادانە لە یاسا و بنەما باوەكان و پابەندی بنەمایە، هەڵوێستی كەس دەردەخات و ڕێكەوتنی كۆمەڵی لەسەر نییە [٢٣]، واتە دەربڕینەكان نامۆ و كەم بەكارهاتوون، ئەمەش نابێتە كێشەیەك بۆ واتا، چونكە لۆجیكی و گونجاون و دەبێتە جێگای باوەڕ لە ڕێگای ئەو پەیوەندییە واتاییەی كە قسەكەر بۆی دەدۆزێتەوە، و ناماڵیش هەر گەیاندن نییە، بەڵكو هێنانەدی شێوازێكی كاریگەرە و ڕۆشنانێكی وردتر لەو ڕۆنانە باو و سواوەی زمانی ئاسایی[٢٤] كە بە داهێنان ناودەبردرێ، كەواتە لادان لە یاسا و ڕێساكانی زمان و هەڵبژاردنی وشە و پاش و پێشكردن و.....هتد زمانێكی تر دروست دەكات وەك لە زمانی شیعر و ئیدیەم و هەندێ گوتنی ناراستەوخۆ......دێتە بەرچاو، چونكە ئەو یاساو ڕێسانە زۆرجار دەبنە كۆت بۆ تاك بۆیە واپێویست دەكات لەم یاسا و بنەمایانە لابدات.

### ٨- واتای گریمانە و ڕاستەقینە

گریمانە لێكدانەوە و بۆچوون دەربڕینە، كە پابەندی ڕاستی و ناڕاستی نییە، (ستروسن) لەو باوەڕەدایە (قسەكەر) گریمانە دەكات، كە (گوێگر) ئاگای لەو زانیارییانە هەیە، كە قسەی لەبارەوە دەكات، بەڵام دڵنیاش نییە كە زانیارییەكە دەزانێ یان نا، بەڵكو بە شێوەی گریمانە دەریدەبڕێت تاكو خۆی بەرپرسیار نەكات لە زانیارییە كە، جا ئەگەر واش نەبێ، ئەوا گریمانەكەش ڕاست دەرناچێت، گوتنەكەش هەڵە نابێ و كەسیش بەرپرسیار نابێ، بەڵكو نە ڕاست و نەهەڵەیە (٢٥) (فیلمۆر) (١٩٧١) دەوروبەری گریمانە لێكدەداتەوە لە ڕستەیەكی وەك :

- بۆ ناچیته لای دکتۆر؟

لەم بارەدا پەیوەندیی نێوان (قسەکەر) و (گوێگر) نیشان دەدرێ و داوای (قسەکەر) لە چوونی بۆ لای دکتۆر و نەخۆشی کەسەکە و کەمتەرخەمی و......هتد، کە ئەمانە هیچ یەکیان لە رستەکەدا نەهاتوون[٢٦]. بەڵکو گریمانەی بۆ کردوون.

گریمانە پێشەکییەکان لەلایەك سەر بە سیمانتیکە، چونکە هەموو گوتنێکی (قسەکەر) گریمانە نییە زۆرجار زانراوە، لەلایەکی تریشەوە سەر بە پراگماتیکە، چونکە زۆر جار زانیارییەکان گریمانەن و گومانن و راستی نەسەلمێندراوە جا ئەگەر (گوێگر) دان بە قسەکان دابنێت ئەوا لە گریمانەیی دەردەچێت، ئەگەر نا ئەوا بە گریمانەیی دەمێنێتەوە تا بەڵگەی پێویست بەدەست دەکەوێت، بۆ نموونە رستەیەکی وەك:

- ئازاد کتێبەکەی ونکرد.

لەم رستەیە (قسەکەر) گریمانەی کردووە ئازاد هەیە و ونی کردووە، جا راست دەردەچێت ئەگەر بە راستی ئازاد کتێبەکەی ونکردبێ، ئەگەر واش نەبێ ئەوا گریمانە و بۆچوونی (قسەکەر)ە و پابەندی دروستی نادروستی نییە. و زۆرجاریش هەڵەکان بەمەبەستن و لە ژێر کاریگەری دەروونی دان.

## ٨- ئیشاکراو و ئیشانەکراو:

(نیشانکار)ەکان ئەو کەرستانە دەگرنەوە، کە ئاماژە بۆ کەس و کات و شوێن و پلەو پایەی هاوبەشەکان دەکات[٢٧]. و خاڵێکی لێکجیاکەرەوە یە لە نێوان سیمانتیك و پراگماتیك.

سیمانتیك گرنگی نادات بە (نیشانکار)، چونکە چەمکە گشتیەکەی لا مەبەستە و گوێ نا داتە هاوبەشەکان و کات و شوێنی قسەکردن. لە رستەیەکی وەك:

- بە پێغەمبەر بۆت دێنم

ئەگەر لەم رستەیە هاوبەشەکان و کات و شوێن دەستنیشان بکرێت ئەوا لێل دەبێت و زۆر واتا هەڵدەگرێت بەمەش گرنگی نادا بەوەی کە وشەی (پێغەمبەر) بۆ کامە پێغەمبەر دەگەرێتەوە.

(نیشانکار) جێگای گرنگی پراگماتیکە، و مەبەستییەتی بزانێ کەسی (قسەکەر) و (گوێگر) و هاوبەشەکان کێن و کات و شوێنی قسەکردن کەیە، بۆ لێکدانەوەی وردی واتا[٢٨]. هەر لەم رستەیەی سەرەوە ئەگەر زانرا هاوبەشەکان کێن، بۆ نموونە ئەگەر کەسی قسەکەر (کریستیان) بێت ئەوا دەزانرێ مەبەست کامە پێغەمبەرە.

(نیشانکار) دوو جۆرە:

١. ئاماژە بۆ کراو.
٢. گەرانەوەیی.

بۆ نموونە هەردوو وشەی (باکوری عێراق- کوردستان) هاواتان بەپێی ئاماژەیان بۆ یەک شت .بەلآم گەرانەوەیان بۆ کەسەکان جیاوازە. (باکوری عێراق) وتەی کەسێکە کە ناحەزی کوردە و (کوردستان) یش وتەی کەسێکی کوردە یان دۆستە کوردە.

## ١٠- جیاوازی لێوان واتای سیمانتیکی و پراگماتیکی

| | واتای سیمانتیکی | واتای پراگماتیکی |
|---|---|---|
| ١. | واتا بریتییە لە (واتای وشە +کاریگەری ریزمانی) | واتای بریتییە لە (واتای سیمانتیکی+واتای دەوروبەر) |
| ٢. | واتای سەرزاری روون و ئاشکرا دەگرێتەوە. | واتای شاراوە و قووڵ دەگرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ٣. | پابەندی یاسا و بنەمای هاریکاری پیادە دەکات. | پابەندی بنەمایە و یاساکان دەبەزێنێ. |
| ٤. | هێمای زمانی لێکدەداتەوە. | هێمای زمانی و نازمانی لێکدەداتەوەو مێشک دەخوێندرێتەوە. |
| ٥. | واتایەکی بلاوە کۆمەڵ لەسەری ڕێکەوتووە. | تاکەکەسییە و ڕێکەوتنی کۆمەڵی لەسەر نییە. |
| ٦. | پابەند نییە بە دەوروبەر. | پابەندە بە دەوروبەر. |
| ٧. | پابەندی توانست و یاساکانی زمانە. | پابەندی چالاکییە و داهێنانە. |
| ٨. | واتایەکی ئاسایی هەیە | واتایەکی نائاسایی هەیە. |
| ٩. | لێکدانەوەی واتای فەرهەنگییە. | لێکدانەوەی مەبەستی قسەکەرە. |
| ١٠. | واتایەکی نەگۆڕە. | واتایەکی گۆڕاوە بەپێی کەس. |
| ١١. | واتایەکی تەمومژاوییە. هێماکان نیشان نەکراون | واتایەکی تەمومژاوی نییە. هێماکان نیشانکراون. |

**ئەنجام:**

- واتای سیمانتیکی و پراگماتیکی هەردووکیان پەیوەندییان بەتێگەیشتنەوە هەیە و هێما لێکدەدەنەوە و تەواوکەری یەکترین.
- هەردوو واتاکەش لەم خاڵانە دا جیاوازن وەک:

١. هێما لە واتای سیمانتیکی نیشانەکراوە، بەڵام لە واتای پراگماتیکی ئاماژە بۆ کەس و کات و شوێن و ڕووداو دەکات.

٢. واتـای سـیمانتیك بریتییـه لـه (واتـای وشـه +كاریگـەری) ڕێزمـانی و واتـای پراگماتیكی بریتییه له (واتای سیمانتیكی+واتای دەوروبەر)
٣. واتای سیمانتیكی تەنها واتـای سـەرزاری ڕوون و ئاشـكرا دەگرێتـەوە ، واتـای پراگماتیكی واتای شاراوە و قووڵ دەگرێتەوە.
٤. واتای سیمانتیكی پاساو بنەمای هاریكاری پیادە دەكـات، واتـای پراگمـاتیكی پابەندی بنەماو هەلۆیـستی كەسـە و پاسـاكان دەبەزێنێ.
٥. واتای سیمانتیكی تەنها واتای هێمای زمانی لێكدەداتەوە، واتـای پراگمـاتیكی واتای هێمای زمانی و نازمانی لێكدەداتەوە و مێشك دەخرێنێتەوە.
٦. واتـای سـیمانتیكی واتایـەكی بـلاوە كۆمـەڵ لەسـەری ڕێكـەوتووە، واتـای پراگماتیكی واتایەكی تاكەكەسییە و ڕێكەوتنی كۆمەڵی لەسەر نییە.
٧. واتای سیمانتیكی پابەند نییـە بـە دەوروبـەر، واتـای پراگمـاتیكی پابەنـدە بـە دەوروبەر.
٨. پابەندی توانـست و پاسـاكانی زمانە، واتـای پراگمـاتیكی پابەنـدی چـالاكییە و داهێنانە.
٩. واتـای سـیمانتیكی واتایـەكی ئاسـایی هەیـە، واتـای پراگمـاتیكی واتایـەكی نائاسـایی هەیە.
١٠. واتـای سـیمانتیكی لێكدانـەوەی واتـای فەرهەنگییـە، واتـای پراگمـاتیكی لێكدانەوەی مەبەستە.
١١. واتای سیمانتیكی واتایەكی نەگۆڕە، واتای پراگماتیكی واتایەكی گۆڕاوە بەپێی كەس هەربۆیەش گرفتی تێگەیشتن دێتە ئاراوە.
١٢. واتـای سـیمانتیكی واتایـەكی تەمومژاوییـە، واتـای پراگمـاتیكی واتایـەكی تەمومژاوی نییە و دەوروبەر ڕوونی دەكاتەوە.

**پەراوێزەکان**

١. میلکا اڤیتچ: ١٩٩٦: ٣٥٢.
٢. عزمی اسلام: ١٩٨٥: ٥٥.
٣. محمد محمد یونس: ١٩٩٣: ١٣٠.
٤. یحیی احمد: ١٩٨٩: ٨٤.
٥. محمد معروف فتاح: ١٩٨٥: ٤٤.
٦. سەرچاوەی پێشوو: ١٩٨٥: ٤٤.
٧. کلود جرمان و ریمون روبلان: ١٩٩٤: ٤٦.
٨. هدسون: ١٩٨٧: ٢٢٨.
٩. لاینز: ١٩٦٨: ٢٣.
١٠. ستیفن اولمان: ١٩٨٦: ٦٣.
١١. نعوم جومسکی: ١٩٨٥: ٧-٨.
١٢. عەبدوڵا عەزیز محمد: ١٩٩٠: ٧٣.
١٣. (محمد محمد یونس: ١٩٩٣: ١٣٨).
١٤. Jean Aitichison:1993:89.
١٥. محمد معروف فتاح: ١٩٨٥: ٢٣٣.
١٦. Adrian & (others): 1984: 395.
١٧. سەرچاوەی پێشوو.
١٨. جمعە سید یوسف: ١٩٩٠: ١٢٨.
١٩. محمد معروف فتاح: ١٩٨٦: ٦٩.
٢٠. سەرچاوەی پێشوو
٢١. عادل فاخوری: ١٩٨٩: ١٤٦.
٢٢. موفق الحمدانی: ١٩٨٢: ٢٢٢.
٢٣. Leach: 1996:5.

۲۴. جان کوهن: ۱۹۸۶: ٤٦.

۲۵. جولیا.اس.فالك: ۱۳۷۷: ۳۷۲.

۲۶. اف.ار.پالمر: ۱۹۸۱: ۱۹۲.

۲۷. Fromkin & Rodman: 1983: 190.

۲۸. Lievinson: 1997: 54.

**سەرەتا:**

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم هەندێ لە زمانەوانەکان دەیانویست سیمانتیک لە رووی تیۆری و پراکتیکییەوە بە پەیوەندی چەمکی سنووردار بکەن نموونەی لەم کارەش کارەکانی (کاتز و فۆدەر)ە، کە لە سالی ١٩٦٣ لێکۆڵینەوەیەکیان لە ژێر ناوی پێکهاتەی تیۆرێکی سیمانتیکی( *The structure of a semantic theory* ) بلاوکردەوە دواتر لە لایەن کاتزەوە هەندێ گۆڕان بەسەر تیۆرەکەدا هات، تیۆرە کە پەرەپێدانی (ڕێزمانی بەرهەمهێنان و گوێزانەوەی) چۆمسکی بوو. (کاتز و فۆدەر) لایان وا بوو تیۆرێکی واتایی پێویستە توانای دەربڕین و لێکدانەوە لای خاوەن زمانەکان شیکاتەوە ئەوان بە شێوەیەکی تیۆری باس لە کەسی (A) و (B) دەکەن، تەنیا جیاوازیان ئەوەیە کە کەسی (B) یاسا واتاییەکانی زمانەکە نازانێت.

شیکردنەوەی واتای ڕستە یەکێکە لە ئامانجەکانی سیمانتیک بێگومان هەولکەی (کاتز و فۆدەر)یش هەر بۆ ئەم مەبەستە بووە، کە واتای ڕستە لە سنووری سیمانتیک و دوور لە دەوروبەر لێکبدەنەوە ئەم باسەی منیش هەولێکە بۆ زانینی ئەوەی ئەم بۆچوونە تاچەند لەگەڵ زمانی کوردی ڕێکدەکەوێت و تاچەند دەتوانێ لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ واتای ڕستە بکات و چارەسەری کێشەی بۆچوونەکانی تر بکات.

ئەم باسە (واتای ڕستە لە دیدی کاتز و فۆدەرەوە)وە، کە باس لە لێکدانەوەی واتای ڕستە دەکات لە سنووری سیمانتیک دوور لە دەوروبەر. لە ژێر ڕۆشنایی ڕێبازی سیمانتیکی بەرهەم هێنان *Generative Semantics*.

**تەوەرەی یەکەم:**

**١. واتای ڕستە:**

ڕستە یەکێکە لە دانە سەرەکییەکانی واتا و مەبەستیشمان لە واتای ڕستە واتا سیمانتیکییەکەیەتی کە تیایدا وشە یەکەیەکی بنچینەیی واتایە و بەشێک لە واتای ڕستە دەگرێتەوە و چەمکی بیری ڕاستەقینەی ئەم وشانەش هەر لە ڕستەدا بەدیار

دەکەوێت.[١] واتای ڕستە بە زانینی واتای وشەکان تەواو نابێت و گرنگی ڕیزکردنی ئەم وشانەش کاریگەرییەکی زۆری بەسەر واتاکەیدا هەیە[٢] ئەمەش بیرە سەرەکییەکەی تیۆری پێکهاتەی سیمانتیکی (کاتز و فۆدەرە)، واتای ڕستە بە پێی ئەم تیۆرە دوور لە دەوروبەر لێکدەدرێتەوە هەروەك (بلۆم فیلد) بانگێشەی ئەوە دەکات کە واتای ڕستە دەبێت دوور لە دەوروبەر لێکبدرێتەوە، چونکە ئەگەر واتای ڕستە بە دەوروبەر ببەستینەوە ئەوا واتای وشە کۆتایی نایەت[٣].

## ٢. پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا

(لاینز) پێیوایە ڕستە گەورەترین دانەیە لە شیکردنەوەی ڕێزمانەدا[٤]. واتای وشە لە ناو ڕستەدا سنووردار دەبێت و بەشێك لە واتای زیادە لە ئەنجامی بەیەکەوە هاتن وەردەگرێت، ئەوەی گرنگە لە واتای ڕستە ڕیزکردنەکەیەتی، چونکە هەر وشەیەك نرخی لە شوێنەکەیدایە هەروەك (سۆسێر) ئاماژەی بۆ دەکات.[٥]

ڕستەسازی پەیوەندییەکی پتەوی بە واتاسازییەوە هەیە ئەم پەیوەندییەش لە کارەکانی چۆمسکیدا هەستی پێدەکرێت کاتێك لە لە کتێبی پێکهاتە سینتاکسییەکان ١٩٥٧ ئاماژەی بۆ کرد ڕستە سێ پێکهاتی سەرەکی لە خۆوە دەگرێت[٦] کە بریتین لە:



چۆمسکی بۆ جیاکرنەوەی رستە لە یەکتری پەسندی یاساکانی گواستنەوە دەکات لە پاش پەیڕەوکردنی ئەم یاسایانە ئەوا پێکهاتەی سەرەوە خوێندنەوەی رستەکە دەبەخشێ و پێکهاتەی ژێرەوەش واتای رستەکە دەبەخشێ[٧]. ئەمەش بە داپیانانێکی فەرمی بوو بە پەیوەندی نێوان رستە و واتا[٨].

((جۆن لاینز)) پێی ئەستەمە سنوور لە نێوان (رێزمان و واتا) دابنرێت، چونکە رستە لەسەر دوو بنەما بەندە، (پەسندی رێزمانی و پەسندی واتا)[٩] بەمەش رێزمان و واتا ناوێتەی یەکتر دەبن و ناتواندرێت لە یەك جیابکرێنەوە، بۆ نموونە رستەیەکی وەك:

*بەرخەکە وانەکەی نووسی؟*

ئەم رستەیە لە رووی رێزمانەوە پەسندە، چونکە پێداویستییەکانی (کار)ی لە بکەر و بەرکار تێدایە. (بەرخ) (بکەر)ە و (وانە) (بەرکار)ە و (نووسی)یش کارە، و لە رووی رێکەوتنی رێزمانیش تەواوە تەوەی ئەم رستەیەی ناوێزە کردووە (واتا)یە، جا لەبەر ئەوەی ئەم رستەیە لە رووی واتایەوە تەواو نییە بە رستە ناژمێردرێت.

## ٣. ئەرکی واتای رستە:

(کاتز و فۆدەر) چوار ئەرك بۆ واتای رستە دەستنیشان دەکەن کە بریتین لە:

**أ- لێکدانەوەی ئەمەزای واتایی لە چوارچێوەی رێزمانی (چۆمسکی)، بۆ نموونە رستەیەکی وەك : *ئاشەکە سوتا* ئەمەزاویە و دوو واتا دەگەیەنێت:**

١. چێشتەکە سوتا.

٢. ئاشە (طاحونة)کە سوتا



ناشەکە سووتا
ناش (چێشت)ەکە سووتا
گ.ك
گ.ن
ناساندن
ناو
کار
کات
رەگ
راناو
ا
سوت
ە
دکە
چێشت

٣.



ناشەکە سووتا
ناش (تاحونە) ەکە
گ.ک
گ.ن
کار
راناو
تاساندن
ناو
لات
ڕەگ
ا
سوت
ە
ەکە
تاحونە

ب- دەستنیشانکردنی لێکدانەوەکانی ڕستە وەك:

- دیدار لە پۆلی دووەم دەخوێنێ.

ئەم ڕستەیە هەرچەندە یەك ڕوونیشی هەیە بە تەمومژاوی دادەنرێت، چونکە لەوانەیە مەبەستمان پۆلی دووەمی سەرەتایی یان ناوەندی بێت، دەشتواندرێ بە زیادکردنی دیارخەرێك تەمومژەکە بڕەوێندرێتەوە وەك:

- دیدار لە پۆلی دووەمی سەرەتایی دەخوێنێ.

ت- دیارخستنی ناوێزەیی واتایی، بۆ نموونە ڕستەیەکی وەك:

- هونەری وێنە بێدەنگە؟

ئەم ڕستەیە بە ڕستەیەکی ناوێزە دادەنرێت، چونکە قسەکەری بیانی ناگاتە ڕاستی ئەم مەسەلەیە، ئەمەش بە ڕای (کاتز و فۆدەر) پەیوەندی بە تیۆری واتاییەوە هەیە بۆ دەرخستنی ئەم ناوێزەییە.

پ- پێکهێنانی هەندێ ڕستە جا ئەو ڕستانە لێکدانەوەیی بن یان نالێکدانەوەیی بن، چونکە هەموو قسەکەرێکی زمانی دایك بۆی هەیە چەند ڕستەیەکی گونجاو و نەگونجاو دروست بکات[١١]، بۆ نموونە: ڕستەی:

*شیری شکاند:*

ئەم ڕستەیە پەیامە لە ناو پەیام و چەند واتایەکی هەیە و هەندێکیان ناوێزەن وەك:

**أ- ئەو شمشێری>+ڕەق+سپی+تیژ< ی شکاند.**

**ب- ئەو (حلیب)> +شلە+سپی+خام< ی شکاند؟**

هتد لێرەدا ڕستەی (ب) بە ناوێزە دادەنرێت، چونکە شکاند دەدرێتە پاڵ شتێك کە ڕەق بێت نەك شلە.

جا هەرچەند ڕاڤەی تەمومژ و ناوێزەیی و دیاریکردنی لێکدانەوەکانی واتا زۆربێت بیردۆزەکانی واتایی گرنگی دەدات بە:

**A. دەربڕینە دژەکان:**

ئەم جۆرە دەربڕینانە بەیەکدادانی واتایان تێدایە و کەرەستەکانی ناو رستە لەگەڵ یەکدا ناگونجێن و دژیەکن وەك:

کچەکە ژنی پیاوێکی رەبەنە؟

ناویزەیی ئەم رستەیە لەوە دایە (رەبەن)، واتە پیاوی (بێ ژن) جا پیاوەکە کە ژنی نەبێ چۆن کچی دەبێ؟

**B. : گرنگی دەدات بە پەیوەندی نێوان ئەم دوو دەربڕینە کە دژواتای پێچەوانەن گرتنی هەریەك لەم رستانە سەلماندنی ئەوی تره(١١) وەك:**

١. قوتابییەکی زۆر نەیانتوانی وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە.

واتە:

٢. هەندێك لە قوتابییەکان لە پرسیارەکە گەیشتبوون.

**C. داپۆشین:**

لەم پەیوەندییە واتاییەدا زاراوەیەکی گشتیمان هەیە چەند زاراوەیەکی تایبەتی دادەپۆشێت هەر بۆیەش پێی دەڵێن وشە داپۆشەر [١٢] وەك:

١. باڵندەیەکم هەیە.

٢. بولبولێکم هەیە.

لێرەدا باڵندە هەموو جۆرە باڵندەیەکی وەك بولبول و بەبەغا و کەو و کۆتر و ......هتد دادەپۆشێ، بە بۆچوونی واتاناسان دەبێ ئەم جۆرە رستانە ملکەچی لۆجیك بێت و دوو جۆرە راستی جیابکرێنەوە:

أ- ئەو راستیانەی لەسەر بناغەی لۆجیکی بنیاتنراون

ب- ئەو راستیانەی پەیوەندییان بە واقیعەوە هەیە.

بۆ نموونە کاتێك دەڵێن:

١. هەموو زیندووەکان مردوو نین.

ئەمە بۆ راستییەکی لۆجیکی شیکردنەوەی دەگەڕێتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی کە بڵێین:

٢. هەموو زیندووەکان بەختەوەرن

کە لێکدانەوەی دەوەستێتە سەر راستی تێبینی کراو نەك واتای وشە و رێزمانی ناو رستەکە. [١٣].

**تەوەرەی دووەم:**

**١. واتای رستە لە دیدی کاتز و فۆدەرەوە**

کاتز و فۆدەر لە ساڵی ١٩٦٣ لە ناونیشانی *Language* لێکۆڵینەوەیەکیان بڵاوکردەوە دەربارەی (پێکهاتەی *The structure of a semantic theory* تیۆریکی سیمانتیکی )[١٤]، کە بە تەواوکەری رێزمانی بەرهەم هێنانی چۆمسکی دادەنرێت (پێکهاتی سینتاکسی *Syntactic Structures*) لە ١٩٥٧ و کە چۆمسکی زۆر سوودی لە بیرۆکەکەیان وەرگرت. تیۆرەکەی (کاتز و فۆدەر) کاریگەرییەکی تەواوی کردە سەر تیۆری پێوانەی رێزمانی گوێزانەوە، کە چۆمسکی لە کتێبەکەیدا ١٩٦٥ خستیەڕوو و وای لێکرد بە تیۆرەکەی دابچێتەوە لە بەرهەمی دووەمیدا (چەند لایەنێکی تیۆری پێکهاتی سینتاکسی *Aspects of the theory of syntax 1965*) ناستی واتا لە رستە جیابکاتەوە [١٥].

ئەم تیۆرەی (کاتز و فۆدەر) بۆ ئەوە دانرا کە دوو ئەرك ئەنجام بدات [١٦]:

A. جیاکردنەوەی پەیوەندی لۆجیکی نێوان رستەکان وەك: هاوواتا دژواتا و بەش لە گشت و گرتنەوە،....هتد، هەروەها رستە ناوێزە و تەمومژەکان.

*B*. دیاریکردنی لێکدانەوەی واتای رێزمانی رستە.

(کاتز و فۆدەر) تیۆرەکەیان لەسەر بناغەی شیکرنەوەی واتای وشە بۆ کەرستە پێکهێنەرەکانی لە گشتەوە بۆ تایبەت لە دابەشکردنێکی هێلکاریدا خستەڕوو[١٧] وەك:

ژن = < +مرۆڤ +هەراش +مێ >

(کاتز و فۆدەر) لەم باوەڕەدابوون تەمومژی هەندێ رستە تەنها لە لێکدانەوەی واتای وشەکاندا دەبێت، کەجەخت لەسەر سیما سەرەکییەکانی واتای وشە دەکات[١٨].

وەك:

• پورەکەی ئازاد پاشە.

ئەم رستەیە تەمومژەکەی لە وشەی (پور)ە، چونکە دوو واتای هەیە (پوری چاڵ) و (پوری بیرکردنەوە) لە هەمانکاتیشدا (کاتز و فۆدەر) وەك زمانەوانانی پێش خۆیان درکیان بە ڕێزکردن و پەیوەندی وشەکان کرد و پێی وابوو واتای فەرهەنگی وشەکان لە رستەدا ئامان گەیەنێتە واتای رستەی تەواو[١٩].

دەورویەر پەیوەندی پێکهاتەی سیستەمی زمان دیاری دەکات هەر ئەو پەیوەندییەش واتای وشە و رستە دیاری دەکات[٢٠].

(کاتز و فۆدەر) لە تیۆرەکەیاندا تەواوی (دەورویەر) رەتدەکەنەوە لەو باوەڕەدان ئەم تیۆرە هەموو زانیارییەکانی کە لە جیهاندا هەیە دەتوێنێ هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن دەڵێن چ زانیارییەکی نازمانی بەکاردەهێنرێت بۆ تێگەیشتنی رستە؟ ئەو نموونەی کە بۆ پاڵپشتی قسەکەیان خستیانەڕوو بریتی بوو لە:

١. ئایا منداڵەکان بگەڕێنینەوە بۆ باخچەی ئاژەڵان؟

٢. ئایا پاسەکە بگەڕێنینەوە بۆ باخچەی ئاژەڵان؟

٣. ئایا شێرەکە بگەڕێنینەوە بۆ باخچەی ئاژەڵان؟

بۆ تێگەیشتنی ئەم رستانە پێشنیاری ئەوە دەکەن، کە دەبێ زانیاری تەواومان دەربارەی (منداڵ و پاس و شێر) هەبێت، کە هیچ بیردۆزێکی ڕێزمانی ناتوانێ ئەمانە بگەڕێنێتەوە بە شێوەیەکی راست[٢١].

(کاتز و فۆدەر) پێیان وابوو ناماغی (واتاسازی semantics)لێکدانەوەی خوێندنەوەکانی رستەیە، بۆ نموونە رستەیەکی وەک:

- لەوانەیە ئازاد بێت

ئەم رستەیە رستەیەکی لێلە، چونکە دوو خوێندنەوەی هەیە:

۱. لە وانەیە ئازاد بێت بە واتای (هاتنی ئازاد).
۲. لەوانەیە ئازاد بێت (بەواتای ئەو لە بەندیخانە بەربێت)

تەمومژی ئەم رستەیە دەتواندرێ بە زیادکردنی هەندێ کەرەستە لابرێ، کە لەو باوەڕەدابوون لادانی تەمومژ لە رستە ئاماغی سەرەکی واتاسازییە.[22]

## ۲. بنەما تیۆرییەکانی کاتز و فۆدەر

بنەما تیۆرییەکانی (کاتز و فۆدەر) دەتواندرێت لە چوار خاڵدا بخرێتەڕوو کە بریتین لە:

### ۱. ئاستی ژێرەوە Deep structure :

پێکهێنەری سینتاکسی هەر رستەیەك لە دوو ئاستدا دەبێت ئاستی سەرەوە بۆ چۆنییەتی گۆکردنی رستەیە و ئاستی ژێرەوەش، کە بریتییە لە پەیوەندییە ناوخۆییەکانی نێوان کەرستەکانی رستە[23] بۆ لێکدانەوەی واتای رستەیە، چونکە پەیوەندی واتایی نێوان رستەکان نیشاندەدات[24] بنجی پێکهێنەری سینتاکسی لە دوو بەش پێکدێت (پێکهێنەری پۆلی و فەرهەنگ) پێکهێنەری پۆلی بریتییە لە سیستەمی یاساکانی دووبارە نووسینەوەی رستە کە دوو ئەرکیان هەیە:

۱. دیاریکردنی پەیوەندییە ڕێزمانییەکانی نێوان وشەکانی رستە.
۲. دیاریکردنی چۆنییەتی ڕیزبوونییان لە ئاستی ژێرەوەدا .

مەبەست لە فەرهەنگیش کەرەستە فەرهەنگییەکانە کە لە هەڵگری هەموو ئەو زانیارییانەن کە پێکهێنەری فۆنۆلۆجی و واتایی لە ڕێزمان و لایەنی گوێزانەوە لە پێکهێنەری سینتاکسیدا پێویستییان پێدەبێت، هەروەها هەڵگری ئەو زانیارییانەن

که شوێنی دروستی وشەکان لە رستەدا دەستنیشان دەکات[٢٥]. ئەم بیرەی چۆمسکی کە بە تیۆری ستاندەرد ناسراوە لە ساڵی (١٩٦٥) بڵاوکرایەوە لە ژێر ناوی (چەند لایەنێکی تیۆری پێکهاتی سینتاکی [٢٦]).کە دوای رەخنەکانی کاتز و فۆدەر هات کە لەم هێلکارییەدا دەیخەینەروو:




ئاستی ژێرەوە کاریگەری هەیە بەسەر واتا جا ئەگەر دوو رستە خاوەنی ئاستێکی ژێرەوەی هاوبەش بن ئەوا هاوواتان ئەگەر خاوەن ئاستی ژێرەوەی جیاوازبن ئەوا

هاوواتانین ئەگەر ئاستی سەرەوە شیان وەك یەك بێت. لەم كاتەدا ڕستەكە دەبێتە ڕستەیەكی لێل.

لێلی دەربڕینێكە زیاتر لە مانایەك دەبەخشێ نێمە لە ڕستەی تەمومژاوی پێویستیمان بە ئاستی ژێرەوە دەبێت، لێلیش دوو جۆرە:

A- لێلی مۆرفۆلۆجی: كە ئاستی وشە دەگرێتەوە وەك ( فرەواتا و هاوبێژ)

بۆ نموونە وشەی (ڕواندن) هاوبێژە و دوو واتای هەیە:




B- لێلی ڕستە كە ئەو ڕستانە دەگرێتەوە زیاتر لە مانایەكیان هەیە ئەویش لە بەر ئەم هۆیانە خوارەوە:

**أ- بوونی وشەی فرەواتا و هاوبێژ لە ڕستەدا:**

وەك:

- ئازاد ئازار لە دڵ دەروێنێ.

ئەم دوو واتایەی هەیە:

١- ئازاد ئازار دەخاتە دڵ.

٢- ئازاد ئازار لە دڵ لادەدات.

**ب- جیایی لە ئاوازی ڕستە.وەك:**

هەر چواریان هاتن.

ئەم دوو واتایەی هەیە:

١- هەموویان چواربوون و هەموویان هاتن. بۆ ئەم واتایە هێز لەسەر وشەی (هەر)ە

٢- زیاتر بوون تەنها چاریان هاتن. بۆ ئەم واتایە هێز لەسەر وشەی (چوار)ە

**ث- هەبوونی دوو پەیوەندی جیاواز لە بەشەکانی رستە لە بنجدا و دەرنەکەوتنی ئەم جیاوازییە لە سیمادا وەک:**

- ژن و پیاوی پیر هاتن.

ئەم دوو واتایەی هەیە:

١- (ژن ، پیاو ) ی پیر هاتن. واتە (ژن و پیاوەکە هەردووکیان پیرن).

٢- کچ و (کوڕی گەنج ) هاتن. واتە (ژن و پیاوە پیرەکە هاتن).

**پ- لە ئەنجامی سەپاندنی یاسای گۆڕانەوە دێتە کایەوە و دوو رستەی جیا لە بنجدا دەکەن بە هاوسیماء وەک:**

- پێم شکا

بۆ نموونە ئەم رستەیەی سەرەوە دوو واتای هەیە:

١- قاچم شکا. واتە (قاچم شکا)

٢- توانیم بیشکێنم. واتە (توانیم بیشکێنم)

واتای یەکەم لە ئەنجامی ئەوە هاتووە کە دەکرێ راناوی سەربەخۆی هەبێ بکرێ بە لکاو بەگوێرەی ئەم یاسایە (پێی من ) دەبێتە (پێم).کە (م) جێگای (من) دەگرێ رۆڵی (ی) ی بەستن نامێنێ.

واتای دووەم لە زمانی کوردیدا یاسایەک هەیە راناوی سەربەخۆی بەرکاری دەشێ بە بە راناوێکی لکاو جێگیر بکرێ ئەگەر راناوەکە دوای (بە)بێ دەبێتە (پێ) بەم یاسایە (بەمن) دەبێتە (پێم)[٢٧].

## ٢. فەرهەنگی وشە Lexicon:

فەرهەنگی وشەکان لە نێوان خۆیاندا بە تۆرێکی واتایی بەیەکەوە بەستراونەتەوە پۆلێن کراون و خاوەن زمانەکانیش مانای وشەکانی زمانەکەیان دەزانن و فەرهەنگیش بریتییە لە ژمارەیەکی زۆر لە وشە و و واتا، [٢٨] ڕێزمان بێ فەرهەنگی وشە ناتوانێ جیاوازی واتایی ئەم ڕستانە دیاری بکات:

١. پشیلەکە مشکەکەی خوارد.
٢. پشیلەکە گۆشتەکەی خوارد.
٣. پشیلە کە پەنیرەکەی خوارد.

لەم ڕستانەی سەرەوە ئەگەر واتای (پشیلە و مشك و گۆشت و پەنیر و خوارد ) نەزانین ئەوا ناتوانین جیاوازی ئەم سێ ڕستەیە بکەین، چونکە لە ئاستی ڕستەسازیدا یەکن،

هەروەها فەرهەنگی وشە گرنگی هەیە کاتێك وشەیەك شوێنی وشەیەکی گرتەوە ئەوا واتایان دەگۆڕێت وەك:

٤. بورتلێك ئاوم خواردەوە
٥. پەرداخێك ئاوم خواردەوە.

واتای ڕستە بەرهەمی واتای فەرهەنگی و ڕێزمانییە [٢٩]. هەر بۆیەش ئەم دوو ڕستەیەی خوارەوە دوو واتای جیاواز دەدەن هەرچەندە لە ژمارەی وشەکاندا یەکسانن، بەڵام چونکە لە ڕووی ڕیزکردنەوە جیاوازن ئەوا ئەرك واتاشیان جیاواز دەبێت، چونکە وشەکان شوێنیان گۆڕاوە وەك:

٦. من کاوەم بینی
٧. کاوە منی بینی.

لە فەرهەنگی وشەدا بۆ هەر دەروازەیەك Entry سێ جۆرە زانیاری لەبەر چاو دەگیرێت [٣٠]:

١. نیشانە ڕێزمانییەکان *Grammatical marker* کە بەشە ناخاوتنەکانی هەر دەروازەیەك دەستنیشان دەکات وەك: } ناو{ و }ناوەڵناو{و }ناوەڵکار{و }کار{.....هتد) بۆ نموونە: گوڵ } ناو.{ لێرەدا } ناو{ نیشان دەدات کە دەروازەی ڕێزمانی( گوڵ) ناوە.

٢. نیشانە سیمانتیکییەکان *Semantic marker* کە چەمکە گشتی و هاوبەشەکانی نێوان وشەکان دەستنیشان دەکات کە سەر بەیەك کێڵگەی واتایین لە ڕێگایانەوە وشەیەك لە وشەیەکی تر جیادەکاتەوە، بۆ نموونە لە ڕێگای ئەم نیشانە سیمانتیکیانە دەتوانین چەمکی وشەی هاوبێژی (ژن) کە دوو واتای هەیە ( ژن١ wife) و (ژن٢ women) دەستنیشان بکەین لە ڕێگای دانانی کەوانەی <>.

ژن ١ wife <+مرۆڤ+هەراش+مێ+مێرد>

ژن 2 women<+مرۆڤ+هەراش+مێ >

٣. نیشانە جیاکەرەوەکان distinguishers ئەمە سیمایانەن، کە جیاوازی وردی نێوان وشەکان دەستنیشان دەکات، لە ڕێگای کەوانەی ) ( بۆ نموونە:

ژن ١ wife (+مرۆڤ + هەراش +مێ + مێرد)

ژن ٢ women (+ مرۆڤ + هەراش + مێ)

### ٣. پرۆژەسازدان Projection-Rules:

بریتییە لە چۆنییەتی کۆکردنەوەی واتای کەرەسەکان لەگەڵ یەك کە لە ڕێگای کۆتی هەڵبژاردندا ئەنجام دەدرێت[٣١]. یاساکانی لێکدان و کەوتن دوو ڕۆڵ دەگێڕن:

١. جیاکردنەوەی ڕستەی واتادار و ناوێزە.

٢. دەستنیشانکردنی نواندنە واتاییەکانی ڕستە[٣٢]. بە پێی یاساکانی لێکدانی کەرەسەکان و ڕستەی ناوێزەش هیچ خوێندنەوەیەکی نییە.[٣٣] بۆ نموونە ڕستەی:

- هەڵبەستەکەم لەبەرکرد.

دوو خوێندنەوەی هەیە:

١. هەڵبەستەکەم کردەبەر خۆم؟
٢. هەڵبەستەکەم نەزبەر کرد

لێرەدا رستەی یەکەم واتادار نییە و ناوێزەیە بەر پرۆژە سازدان دەکەوێ، چونکە هەڵبەست ناکرێتەبەر وەك کراس و چاکێت.

پرۆژە سازدان یان خوێندنەوە باس لە هەڵبژاردن و چۆنییەتی پێکهاتی واتای وشەکان لە گرێ و رستەدا دەستنیشان دەکات، کە لە رێگای شیکردنەوەی درەخت تاسا دەنوێندرێت هەر خوێندنەوەیەك شیکردنەوەیەکی بۆ.

بۆ نموونە رستەی ( رۆژ لە شارەکە هەلات ) رستەیەکی تەمومژاوییە و چوار خوێندنەوەی هەیە:

١. رۆژ (ناوی کەس) لە شارەکە رایکرد.
٢. خۆر لە شارەکە رایکرد؟
٣. رۆژ (ناوی کەس) لە شارەکە دەرکەوت.
٤. خۆر لە شارەکە دەرکەوت.

جا رستەی دووەم ناوێزەیە و ناخوێندرێتەوە بۆیە دەبێت سێ هێلکاریشی بۆ بکرێت:

**خوێندنەوەی یەکەم:**



**خوێندنەوەی چوارەم:**



## ٤. کۆتی هەڵبژێرکردن Selection restrictions

لە کۆتی هەڵبژاردندا کەرەستەی بە دەسەڵات (هەڵبژێرە) و کەرەسەی بێدەسەڵات (هەڵبژێردراو)، واتە کەرەسەیەك هەڵدەبژێرێت، کە لە هەندێ سیمادا لەگەڵی بگونجێت[٣٤] کە بە کەوانەی < > هێمای بۆ دەکرێت. بۆ نموونە:

(نووست) کە کاری رستەکەیە پێویستی بە بکەرە ئەم بکەرەش دەبێت<+گیاندار+بەرجەستە > کە دەتوانین بەم شێوەیە بیخەینەڕوو: { + بکەر < +گیاندار+بەرجەستە > { لێرەدا نووست ناوێکی وەك (پیاو) هەڵدەبژێرێت، کە خاوەنی ئەم دوو سیما واتاییەیە، چونکە دەتوانین بڵێین:

- پیاوەکە نووست.

بەڵام ناوێکی واتایی وەك (گەرما) هەڵنابژێرێت، چونکە خاوەن سیمای واتایی <-گیاندار-بەرجەستە > یە هەربۆیەش ناتونین بڵێین:

- گەرماکە نووست؟

زۆرجار ئەم هەڵبژاردنانە بە پێوانە دەبێت، بۆ نموونە کاری (خوێندنەوە) (بکەر) مرکەی دەبێت (مرۆڤ) بێت لە ناو ئەم مرۆڤانەش پێوانە هەیە بۆ نموونە: ئەگەر رستەیەکمان هەبێت شوێنی (بکەر)ەکەی بەتاڵ بوو چەند بکەرێکیشمان لە ناو کەوانە هەبوو و داوایان لێکردین، کە بۆشاییەکە بە بکەرێکی گونجاو پڕ بکەینەوە ئەوا کارەکە و بەرکارەکە بە پێوانە یەکی ورد بکەرەکە کۆت دەکەن و بکەرێکی گونجاو هەڵدەبژێرن وەك:

............رۆژنامەکەی خوێندەوە (مامۆستا، منداڵ، پیاو، قوتابی) لێرەدا کارەکە دەسەڵاتی خۆی دەسەپێنێ و (مامۆستا) کە هەڵدەبژێرێت، چونکە گومان لە خوێندەوارییەکەی نییە، بەڵام (منداڵ) و (پیاو) ئەگەری نەخوێندەواریان هەیە جا (قوتابی)یش هەرچەندە خوێندەوارە و توانای خوێندنەوەی رۆژنامەی هەیە، بەڵام لە نێوان (مامۆستا) و (قوتابی) مامۆستاکە هەڵدەبژێرێت، چونکە قوتابی زیاتر بەخوێندنی وانەکانی سەرقاڵە هاوڕێیەتی نێوان رۆژنامە و قوتابی کەمترە بە پێچەوانەی مامۆستا و رۆژنامە کە هاوڕێیەتی و بەیەکەوەهاتنی زیاترە لە قوتابییەکە بۆیەش ئەگەری خوێندنەوەی رۆژنامەکە لای مامۆستاکە زیاترە..

### ٥. شیکرنەوەیەکی پراکتیکی واتای رستە بەپێی تیۆری کاتز و فۆدەر:

واتای رستە بە پێی تیۆری (کاتز و فۆدەر) بەسەر رۆنانی ژێرەوەدا جیەجێدەکرێت جا پێش ئەوەی واتا بدرێتە وشەکان ئەبێت رۆنانی ژێرەوە دەستنیشان بکرێت، بۆ نموونە رستەی:

- منداڵەکە تۆپەکەی هەڵدا

منداڵەکە تۆپەکەی هەڵدا

گ.ک گ.ن

کار گ.ن ناساندن ناو

کار پێشگر راناو گ.ن

کار پێشگر راناو ناساندن ناو ناساندن ناو

دا هەڵ ی ەکە تۆپ ەکە منداڵ

(هەڵدان) }کار{ی ئەم رستەیە کە یەك خوێندنەوەی هەیە کە (بەرزکردنەوە)یە ئەم کارە تێپەرە و دوو پێویستی دەوێ (بکەر-بەرکار) جا ئەگەر کاری (هەڵدان – بەرزکردنەوە) وەرگرین ئەوا دەبێت بکەرەکەی ئەم نیشانە سیمانتیکیانەی هەبێت:

( + بکەر < +مرۆڤ+توانا+ >) و بەرکارەکەش دەبێت ئەم نیشانە سیمانتیکیانەی هەبێت:

( + بەرکار < +تەن + سووك+خڕ > ) چونکە بەرزکردنەوە لەگەڵ وشەی وەك (تۆپ یان رەشماڵ یان چادر....هتد)دێت.

وشەی (تۆپ) }ناو{ ە کە وشەیەکی (هاوبێژە) دوو خوێندنەوەی، کە نیشانە جیاکەرەوەکانی بریتین لە:

تۆپ ١ = <+بازنەیی+پێست+هەوا >

تۆپ ٢ =<+چەك + رەق + درێژ >

وشەی (منداڵ ) }ناو{ە و یەك خوێندنەوەی هەیە ، کە نیشانە جیاکەرەوەکانی بریتین لە:

منداڵ = <+مرۆڤ –هەراش ± نێر >

کەواتە لە رستەی:

- منداڵەکە تۆپ ەکەی هەڵدا.

منداڵ (١) واتای هەیە.

تۆپ (٢) واتای هەیە.

هەڵدان (١) واتای هەیە.

بە لێکدانی ئەم ژمارانە واتە:

[ 2 = ] 1 x 2 x 1 =2، واتە ئەم رستەیە دوو خوێندنەوەی هەیە لە کاتی لێکدانیان کە بریتین لە:

١. منداڵەکە تۆپی شەڕی بەرزکردەوە؟

٢. منداڵەکە تۆپی یاریکردنی بەرزکردەوە.

لەم دوو ڕستەیەی سەرەوەدا ڕستەی (١) و ناوێزەیە و بەر پرۆژەسازدان (Projection-Rules) دەکەوێ چونکە: ڕستەی (١) کاری (بەرزکردنەوە) بەپێی کۆتی هەڵاوێرکردن Selection restrictions): لەگەڵ (بکەر) ناگونجێ، چونکە منداڵ ناتوانێ (تۆپ) ی شەڕ بەرزبکاتەوە.

ڕستەی (٢) ڕستەیەکی پەسندە و ڕێکەوتنی ڕێزمانی و واتایی تەواوە، چونکە بە پێی کۆتی هەڵاوێرکردن ((Selection restrictions کەرستەکانی ناو ڕستە لە (بکەر) و (بەرکار) لەگەڵ (کار) گونجاون و هاوڕێەتی و بەیەکەوەهاتنیشیان هەیە. بەم شێوەیەش گەیشتینە واتایەکی تەواوی ڕستەکە کە بریتییە لە:

● منداڵە کە تۆپە (یاری) یەکەی هەڵدا (بەرزکردەوە).

لێرەشدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئایا منداڵەکە بە (قاچ)ی یان بە(دەست)ی یان بە(سەر)ی ......هتد تۆپەکەی بەرزکردەوە بۆیش لێرەدا چەند ئەگەرێك سەر هەڵدەدات:

١.ئایا منداڵەکە بە دەستی تۆپەکەی بەرزکردەوە؟

٢.ئایا منداڵەکە بە قاچی تۆپەکەی بەرزکردەوە؟

٣.ئایا منداڵەکە بە سەری تۆپەکەی بەرزکردەوە؟

٤.ئایا منداڵەکە بە سنگی تۆپەکەی بەرزکردەوە؟

٥.ئایا منداڵەکە بە چۆکی تۆپەکەی بەرزکردەوە؟

.............هتد

گومانی تێدا نییە هەر یەکە لەم ڕستانەش چەند ئەگەرێکی هەیە، چونکە (دەست و قاچ و چۆك) هەریەکە (ڕاست) و (چەپ) ی هەیە لە هەمانکاتیشدا تۆپیش جۆر و ڕەنگ و قەبارەی جیاوازی هەیە دیسانەوە ئەم ڕستانە بە تەمومژاوی دەمێننەوە و دەبێت پەنا بەرینە بەر گریمانەکان کە ئەگەری (ڕاستی و ناڕاستی) تێدایە ئەمەش دەبێت ڕەچاوی باری منداڵ بکەین، کە لە تەمەنی چەند ڕۆژێکەوە دەستپێدەکات تاکو (١٨) ساڵ ئەم جۆرانەی بەرزکردنەوەی تۆپیش وەك بەرزکردنەوە

بە (سەر و چۆك و سینگ ) بە شێوەیەکی گشتی لە لای یاریکەرێکی شارەزاوە ئەنجام دەدرێت، بەڵام هەر ئەگەری (قاچ و دەست و جۆر و قەبارە) ی تۆپەکە هەر دەمێنێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆپ بە زۆری هەر بە قاچی راست لێدەدرێت منداڵ تۆپی نایلۆن و رەنگا و رەنگی هەیە، دەبێت ئێمە ئەو گریانە پەسند بکەین کە:

- منداڵەکە تۆپە نایلۆنە رەنگا و رەنگەکەی بە قاچی راستی بەرزکردەوە ئاسمان

هەرچەندە ئەم رستەیە دوور و درێژییەکی تەواوی پێوە دیارە قسەکەر ناتوانێ بەم شێوەیە قسە بکات، چونکە کات و وزەیەکی زۆری دەوێ، بەڵام ئەم لێکدانەوەیەش هەر گریانەیە و ئامان گەیەنێتە راستییەکی تەواو. هەربۆیەش دەبێت ئێمە پەنا بەرینە بەر پراگماتیك، چونکە سیمانتیك ناتوانێت واتای دوورستی رستە لێکبداتەوە، بەڵکو واتای دوورستی رستە تەنها لە ئاستی پراگماتیکدا لێکدەدرێتەوە، چونکە پشت بە دەوروبەر دەبەستێت.

ئەم تیۆرەی (کاتز و فۆدەر) هەر چەندە (شیکەرەوەیی و وردە *Decomposition*)، بەڵام سێ کەموکوڕی تیا بەدی دەکرێت:

١. دەوروبەر پشتگوێ خراوە کە واتای دوورستی رستەی تیا دەردەکەوێ، چونکە هێز و ئاوازە و وەستان رۆڵی واتایی بەرچاویان هەیە.
٢. لە واقیعدا کەس نییە، کە هەموو یاساکانی رێزمانی جگە لە واتاییەکان بزانێت.
٣. زۆرشت هەیە لە ناو رستە سەپێنراوە و تیۆرەکە ئاماژەی بۆ ناکا وەك:
   أ- منداڵەکە دایك و باوکی هەیە.
   ب- منداڵەکە پارەی هەیە.
   ت- منداڵەکە تۆپی کڕیوە.
   پ- منداڵەکە یاری دەکات.
   ج- .....................هتد

دیسان لە سیمانتیکدا کێشەی ئێمە لە رستەیەکی وەك (منداڵەکە تۆپەکەی هەڵدا) دا نییە، بەڵکو دەمانەوێ بزانین ئایا چۆن واتا دەگوازرێتەوە واتە کاتێ دەڵێین (منداڵەکە تۆپەکەی هەڵدا) چ روودەدات و کەسی بەرامبەر چۆن لەم رستەیە دەگات،

هەر لەبەر ئەم هۆیانە و چەندین هۆی تر ئەوەی لە تیۆرەکەی ئەوان بە پەسەندی مایەوە تەنها پەیوەندی چەمکی نێوان رستەکان بووکە بەشێك لە واتای رستەکان دەدات بە دەستەوە، جا هەرچەندە ئەم بۆچوونەی (کاتز و فۆدەر) وردییەکی تەوای پێوەدیارە پرۆژەسازدان و کۆتی هەڵاوێرکردنیش زۆرجار ناتوانێ کێشەکان چارەسەر بکات، بۆیە دەبێت بڵێین کەواتای دروست و تەواوی رستە تەنها لە دەوروبەردا لێکدەدرێتەوە و هەر لێکدانەوەیەکی سیمانتیکی بۆ واتای رستە واتاکەی تەمومژاوییە و دەکەوێتە بە گریانەکردن کە ئەگەری (راستی و ناراستی) تێدایە و دەبێ پەنا بەرینە بەر دەوروبەر بۆ راستی مەسەلەکە بەمەش لێکدانەوەی واتای رستە سنووری سیمانتیك دەبەزێنێت و دەچێتە ئاستی پراگماتیك.

**ئەنجام:**

١- بۆچوونی (کاتز و فۆدەر) بەرای من باشترین بۆچوونە بۆ لێکدانەوەی واتای رستە لە سنووری سیمانتیکدا، بەڵام ناشتوانێ سەرکەوتنێکی تەواو بەدەست بێنێ.

٢- ئەم تیۆرەی (کاتز و فۆدەر) سێ کەموکوری تێدا بەدی دەکرێت کە بریتین لە:

أ- دەوروبەر پشتگوێ خراوە کە واتای دورستی رستەی تیا دەردەکەوێ، چونکە هێز و ئاوازە و وەستان رۆڵی واتایی بەرچاویان هەیە.

ب- لە واقیعدا کەس نییە، کە هەموو یاساکانی رێزمانی جگە لە واتاییەکان بزانێت.

ت- زۆرشت هەیە لە ناو رستە سەپێنراوە و تیۆرەکە ئاماژەی بۆ ناکا.

٣- هەر لێکدانەوەیەکی سیمانتیکی بۆ واتای رستە واتاکەی ئەم مژاوییە و دەکەوێتە بەر گریمانەکردن کە ئەگەری (راستی و ناراستی) تێدایە و دەبێ پەنا بەرینە بەر دەوروبەر بۆ راستی مەسەلەکە.

٤- بۆچوونەکەی (کاتز و فۆدەر) هەرچەندە وردییەکی تەواوی پێوەدیارە، بەڵام (پرۆژە سازدان و (کۆتی هەڵاوێرکردن زۆرجار ناتوانن کێشەکان چارەسەر بکەن، بۆیە پێویستە واتای تەواوی رستە لە ئاستی پراگماتیکدا لێکبدرێتەوە.

٥- ئەوەی لە تیۆرەکەی کاتز و فۆدەر بە پەسندی مایەوە تەنها پەیوەندی چەمکی نێوان رستەکان بووکە بە رێژەیەك توانی تیایدا سەرکەوتوو بێت.

٦- سیمانتیك ناتوانێ واتای دورستی رستە لێکبداتەوە، بەڵکو دەبێت واتای رستە لە ئاستی پراگماتیکدا لێکبدرێتەوە، چونکە پشت بە دەوروبەر دەبەستێ.

## پەراوێزەکان:


١. (طالب حسين: ١٩٩٨: ٥٨).

٢. (پالمر: ١٩٨١: ٥٠).

٣. سەرچاوەی پێشوو: ٥٨).

٤. (lyons:1977:176).

٥. (نورالهدی لوشن: ١٩٩٥: ٨٦).

٦. (سەلام ناوخۆش: ٢٠٠٥: ٦٣).

٧. (جۆن لاینز: ١٩٨٧: ١٦٦).

٨. (Leech:1975:327).

٩. (نورالهدی لوشن: ١٩٩٥: ٨٩).

١٠. (كلود جرمان وريمون روبلان: ٢٠٠٦: ١٧-٢١).

١١. سەرچاوەی پێشوو: ٢٠.

١٢. (احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٩٩).

١٣. (كلود جرمان وريمون روبلان: ٢٠٠٦: ١٧-٢١).

١٤. (شاهر الحسن: ٢٠٠١: ٩٠).

١٥. (كلود جرمان و ريمون روبلان: ١٩٩٤: ١١٢).

١٦. (جودپ جرين:١٩٩٣: ٨٦).

١٧. (احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ١١٤).

١٨. (منقور عبد الجليل: ٢٠٠١: ٩٨).

١٩. (جودث جرين: ١٩٩٣: ٨٦).

٢٠. (بير جيرز : ١٩٩٢: ٤٢).

٢١. (پالمر: ١٩٨١: ٥٩).

٢٢. سەرچاوەی پێشوو: ٥٩.

٢٣. (Harthman: 1976:59).

٢٤. (fowlre: 981:10).

٢٥. (نعوم چومسكي: ١١٥-١٤٧-١٩٨٥:١٤٩).

٢٦. سەلام ناوخۆش: ٢٠٠٥: ٧٦.

٢٧. ( وريا عمر امين: ١٩٩٤: ٦٦-٦٨).

٢٨. (تونس موررو....: ١٩٩٨: ١٨٦).

٢٩. محمد محوي: ٢٠٠١: ٢١٤.

٣٠. احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ١١٦.

٣١. بالمر: ١٩٨١: ١٦١.

٣٢. جون لاينز: ١٩٨٧: ١٧٤.

٣٣. بالمر: ١٩٨١: ١٦٣.

٣٤. ڤيان سليمان: ٢٠٠١: ٩٥.

**سەرەتا:**

واتای هاورێیەتی یەکێکە لەو حەوت جۆرەی (واتا) کە (لیچ) ئاماژەی بۆ کردووە و لە ئەنجامی بەیەکەوەهاتنی وشەکاندا پەیدا دەبێت، لە بواری راگەیاندنیشدا بە دوو شێوە بەکاردێت بە پیادەکردنی هاورێیەتی و پیادەنەکردنی هەر ئەمەش وا لە زمانی راگەیاندن دەکات، کە لە دوو ئاستدا لێکبدرێتەوە (سیمانتیک و پراگماتیک).

ئەم باسە تیشک دەخاتە سەر شیکردنەوەی هەندێ رستەی رۆژنامەکان ، بۆ ئەوەی بزانین تا چ رادەیەک واتای هاورێیەتی لە راگەیاندندا پیادەکراوە. بەپێی رێبازی رۆنانکاری (دیسۆسێر) واتای هاورێیەتی دەستنیشان دەکات و بە پێی رێبازی ئەرکی شیکاریش لادانەکانی شیدەکاتەوە.

## تەوەرەی یەکەم لایەنی تیۆری:

### ١. پەیوەندیی شوێنی

ئەم پەیوەندییەی واتا بریتی دەبێت لە پەیوەندیی وشە بە وشەکانی پاشتر و پێشتری خۆی، بۆ نموونە: هەموو ئەو پەیوەندیانە دەگرێتەوە کە وشەی (سێو) لە بەکارهێنانەکانیدا دەیبەستێتەوە بە وشەکانی تر [1] لە رستەیەکی وەک:

ئازاد (سێو) ەکەی خوارد.

ئەم جۆرە واتایە دوو وشە یان زیاتر بەیەکەوە دەبەستێتەوە و لە ناوەوەی زماندا کاردەکات و واتای هەر وشەیەک دیارناکرێ تاکو وشەکانی دەوروبەری نەزانرێ، چونکە وشەکانی دەوروبەر مانای تاکە وشەکە روون دەکەنەوە و بە واتایەکی تر واتای فەرهەنگی هەر وشەیەک بەشێکە لە واتاکەی لە ناو رستەدا.

(سۆسێر) لەو باوەڕەدایە کە زمان پەیڕەوێکی پەیوەندییە، کە وشەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە و نرخی هەر وشەیەک لەو شوێنەدایە کە تیایدا بەکاردێت [2]، هەر بۆیەش ئەم دوو رستەیەی خوارەوە نابنە هاوواتا:

- کاوە ئازادی بینی
- ئازاد کاوەی بینی

واتای وشە بریتییە لە ژمارەی بەکارهێنانەکانی [3]، هەر بۆیەش هەندێ لە زمانەوانان لەو باوەڕەدان کە یەکەی سەرەکیی واتا ڕستەیە نەك وشە، چونکە واتاکەی ڕوونترە[4]، وشە واتایەکی چەسپاوی نییە و بەگوێرەی شوێنەکەی دەگۆڕێت [5]. کەواتە واتای ڕستە تەنها بە واتای وشەوە نەبەستراوەتەوە، بەڵکو بە هەموو ئەو واتایانەش بەستراونەتەوە کە لەگەڵی بەکاردێن [6]. بەمەش شارەزای هەموو بەکارهێنانەکانی دەبین [7] کە لە کۆمەڵدا باوە، بەم پێیە واتا لە کێشەی چەمك و وێنەی هۆشەکی و هەست و سۆزی کەس دوور دەخاتەوە کە سنووردار نەبوون و واتایان لە ئەڵقەیەکی بەتاڵ دەسووڕاندەوە. بەمەش لێکۆڵینەوەکانی واتاسازیان بەرەو بابەتی برد، چونکە لە سنووری زمانەوانی دەرناچێت.

دەرکەوتنی وشە لە هەر ڕستەیەکدا دەبێت دوو جۆرە پەیوەندی ڕەچاو بکرێت:




**أ- پەیوەندی ستوونی:**

پەیوەندیی وشەسازی نێوان وشەکان دەگرێتەوە، واتە لە جیاتی دانان یان گۆڕینەوەی وشەیەك بە وشەیەکی تری هاوتەرك لە تەوەرەی ستوونی بۆ ئەوەی کار لە پەیوەندی ئاسۆیی ڕستەکان بکات و هەڵبژاردنیش لە دەست کاردکەیە .

**ب- پەیوەندی ئاسۆیی:**

پەیوەندی گونجان و نەگونجان لە نێوان وشەکان لە سنووری ڕستە و گرێدا دەگرێتەوە، کۆتی هەڵبژاردن و هاوڕێیەتی لە دەست وشە بە دەسەڵاتەکەیە لە ڕستەدا کە (کار)ە، واتە پەیوەندی (بکەر — کار) و (بەرکار-کار)[8] .

وشەیەك هەڵدەبژێرێت، كە لەگەڵیدا گونجاو تەبا بێت.[٩]

بۆ نموونە رستەیەكی وەك:

بەفر سپییە

لەتەوەرەی ستوونیدا دەتوانین وشەی (بەفر) بە چەند وشەیەكی تر بگۆڕینەوە و بڵێین:

شەكر سپییە

كاغەز سپییە

ماست سپییە

................هتد

وە لە تەوەرەی ئاسۆییشدا بڵێین:

بەفر دەبارێت.

بەفر سەرما دەكوژێت.

بەفر لەگەڵ دۆشاودا دەخورێت.

................هتد

لەم پەیوەندییەدا هەموو ئەو هێمایانە پەیڕەوێك دورست دەكەن بەهای هەر هێمایەك لە پەیوەندی نێوان هێماكاندا هاتووە[١٠].

## ٣. واتای هاوڕێیەتی (collocation meaning)

بەدواداهاتنی وشە لە سنووری رستە بەپێی سیستەمێكی دیاریكراو پێی دەگوترێت هاوڕێیەتی[١١]، لە ئەنجامی بەیەكەوە هاتنی زۆرەوە و دووبارەبوونەوە واتایەك پەیدادەكات پێی دەڵێن واتای هاوڕێیەتی، ئەم جۆرە واتایە پەیوەندییەكی شوێنی ئاسۆییە لە ئەنجامی هاوبەشی كردنی وشەیەك لەگەڵ چەند وشەیەكی تر پەیدای دەكات[١٢]، هاوڕێیەتی، واتە پەیوەندی بەیەكەوەهاتنی وشەیەك لەگەڵ وشەیەكی تر[١٣]، و ئەو واتاییە كە وشە بە هۆی هەڵسوكەوت و هاتنی لەگەڵ

وشەی تردا پەیدای دەکات [١٤]، لەسەر بنەمای پەیوەندی وشەیی کار دەکات [١٥] بۆ نموونە هەردوو وشەی (چاك و باش ) لە هاوواتا دەچن بەڵام لە واتای هاوڕێیەتیدا لە یەکتریدا جیان وەك:

١. بەیانیت باش

٢. بەیانیت چاك

لێرەدا دەبینین رستەی دووەم ناناسایی واتایی دروست کردووە، چونکە بەکارنایەت. (بەیانی) هاوڕێیەتی لەگەڵ (باش) زیاترە نەك (چاك) هەر ئەم هاوڕێیەتییەشە دەبێتە کۆت لەبەر دەم نەبوونی هاوواتیی تەواو.

ئەم جۆرە واتایە لە سنووری فرێز و رستەدا هەستی پێدەکرێت و بنچینەکی زانستیانەی هەیە [١٦]، چونکە دوورە لە داب و رەوشتی کۆمەڵگا و باری دەروونی کەسی.

## ٣. کۆتی هاوڕێیەتی:

هاوڕێیەتی، واتە پەیوەندیی ناسایی وشەیەك بە هەندێ وشەی تر لە ناو رستەیەکدا، هەندێ دەستوور و یاسا دەگرێتەوە کە لەسەری رێککەوتووین لە بەکارهێنانی وشەکاندا [١٧]، پەیوەندیی هاوڕێیەتیی نێوان وشەکانی زمان پلەدارە هەندێ وشە هەن رادەی بەکارهێنانیان بەرزە و هەندێکی تر نزمە، لێرەدا کەرەسەی بە دەسەڵات بە تەواوی زاڵە بەسەر کەرەسە بێدەسەڵاتەکەدا، لە هەر شوێنێکدا بێت ئەوا بە دوای خۆی رایدەکێشێت، ئەم راکێشانەش پێی دەڵێن (کۆتی هاوڕێیەتی) بۆ نموونە:

- کوڕەکە (شیر ، ناو، چای ، شەربەت ، ........) دەخواتەوە.
- کوڕەکە (نان ، سێو ، گۆشت ، ماسی، .......) دەخوات [١٨] .

جا بۆ نموەی قسەکانمان شێوەی نموونەیی وەربگرێت پێویستە بنەماکانی هاریکاریی (گرایس) پەیرەوبکرێت، کە بریتییە لە چوار بنەما وەك: (چەندێتی و چۆنیەتی و، گونجان، شێواز)[19].

## ٤. واتای هاورتیەتی و نائاسایی واتا

رستەسازی پەیوەندیی هێمایە بە هێما [20]، کاتێك وشە لێکدراوەکانی سنووری رستە رستەیەکی پەسندیان داینێ، ئەوا پێی دەوترێت (ئاسایی واتا) کە لەسەر دوو بنەما کار دەکات (رێزمانی رستە و پەسندی واتا)[21] و بەشێك لە واتای رستە لە رۆنانی سینتاکسی دایە [22] و بەزاندنی پەیوەندیی ئاستێی لە سنووری رستەدا، واتە بەزاندنی هاورتیەتی ئەوا نائاسایی واتا دێنێتەکایەوە کە لە رووی واتاوە پەسند نییە، چونکە وشەکان مەرجی رێکەوتنیان تیادا نییە، بەمەش شیکردنەوەی واتاکەی پابەند دەبێت بە واتای دەربڕاوی قسەکەر نەك واتای رووتی وشەکان.[23] و شیکردنەوەی دەکەوێتە ئەستۆی (پراگماتیك)ەوە نائاسایی واتاش دوو جۆرە[24]:

### ١. هەڵئاوسانی واتایی[25]:

لە ئەنجامی ئەوە دروست دەبێت، کە کەرەسەکان واتای دووبارەیان تێدا بێت وەك:

بەفرێکی سارد و سپی باری.

ئەم رستەیە واتای زیادە و هەڵئاوسانی واتایی تیادا بەدی دەکرێت، چونکە بەفر خۆی سیمای (ساردی و سپی) لەگەڵدایە و پێویست ناکات باس بکرێت و لادانیشی هیچ واتا ناگۆرێت ئەگەر بڵێین:

- بەفر باری.

## ٢. پێکدادانی واتایی:

هێنانەوەی دوو وشەیە کە لە هەندێ سیمادا دژ یەک دەوەستن بۆ واتایەکی تر و دەبێتە سێ جۆر:

### أ- ناتەبایی:

هەڵبژاردنێکی هەڵەی وشە هاوواتاکانە، کە لەگەڵ وشەکە بەتەواوی ناگونجێ وەك:

★ شەو چاك.

### ب- دژوازیی:

پلەی ناتەبایی زیاترە و لە ئەنجامی بەیەکەوەهاتنی دوو وشەی دژیەك دروست دەبێت وەك:

★ لاوە پیرەکان هاتن.

### ت- نەگونجان

بەرزترین پلەی بەیەکدادانی واتاییە، چونکە زۆر بەزەحمەت وەرگر پەیوەندیی واتایی بۆ دەدۆزرێتەوە وەك:

★ کچەکە ژنی پیاوێکی رەبەنە.

## تەوەرەی دووەم: لایەنی پراکتیکی:

### واتای هاورێیەتی لە بواری راگەیاندندا

زمانی راگەیاندن لەسەر بنەمای واتای هاورێیەتی کاردەکات، چونکە زمانی راگەیاندن دەبێت زمانێکی سادە و ساکار بێت و پێویستی بە لێکدانەوەی قووڵ نەبێت تا زۆرترین کەس لە چینی خوێندەوار تێی بگات و ئەرك نەخاتە سەر خوێنەر، لە بواری راگەیاندنیشدا بە دوو شێوە دێتە بەرچاو .

#### ١. پیادەکردنی واتای هاورێیەتی لە بواری راگەیاندندا

مەبەستمان لە پیادەکردنی واتای هاورێیەتی و نەبەزاندنی بەندە بە گونجانی وشەکان لە سنووری رستەدا لەگەڵ یەکتر و دەبێت پێویستییەکانی کارەکە وەك (بکەر) و (بەرکار) پێوانە بکرێت لەگەڵ کارەکە و بگونجێت و بابەتی و راست بێت[٢٦]، ئەرکی رۆژنامەنووسی رەسەن ئەوەیە، کە وشەی گونجاو لە شوێنی گونجاو بەکاربێنێت و رستەکان کورت بن و دەستەواژەکان تێکچرژاو نەبن، بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی بە ئاسانترین شێوە تێبگەیەنێت.

.ئەوەتا ئەم رستانەی خوارەوە کەرەستە پێویستییەکانی کارەکانیان هەمووی گونجاون لەگەڵ کارەکانیاندا، بەمەش واتاکانیان راستەوخۆ دەگەیەنرێت:

- سەد ماڵە کوردی سووریا ئاوارەی زەمار بوون.
  (خەبات ل/ ١ ژ/١٤٣٥ لە ٢٠٠٤/٥/١٢)
- پوچەڵکردنەوەی چەند بۆمبێك لە قوتابخانەکانی بەغدا.
  ( جەماوەر ل/١ ژ/٥٣ لە ٢٠٠٣/١١/٣)
- تیرۆرستان هەرەشەی کوشتن لە قوتابیانی کچ دەکەن.
  (باسەرە ل/١ ژ/٢٨ لە ٥ ت٢ ٢٠٠٣)
- بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای زەوی زیان بە زەریاکان دەگەیەنێت.
  (یەکگرتوو ل/٨ ژ/٢٧٣ لە ٢٠٠٠/١/٢٨)

- وەزارەتی مافی مرۆڤی عێراقی کۆنگرەیەك سازدەکات.

(دەنگی میللەت ل/١ ژ/١٥٣ لە ١/٣/٢٠٠٣)

## ٢. پیادەنەکردنی واتای هاوڕێیەتی لە بواری راگەیاندندا

یەکێ لە ئەرکەکانی زمان ئەرکی هەست وروژاندنە بەتایبەتیش زمانی راگەیاندن، جا زۆرجار رۆژنامەکان بۆ ئەوەی زیاتر خوێنەر بۆ خۆیان رابکێشن هەستیان دەوروژێنن کە لەسەر بنەمای پیادەکردنی واتای هاوڕێیەتی دەبێت بە نەگونجانی کەسەکانی ناو رستە لەگەڵ یەکتردا، هەروەك ئەم نموونانەی خوارەوە (بکەر) و (بەرکار)ەکان پلەی هاوڕێیەتی و بەیەکەوەهاتنیان لەگەڵ کارەکانیاندا (سفرە) لە روانگەی واتای سیمانتیك یەوە، هەربۆیەش دەبێ ئەم رستانە لێکدانەوەی قووڵیان بۆ بکرێت، چونکە لە قسەی ئاسایی ناکات، بۆ ئەم مەبەستە گوێگر قورسایەکی زۆری دەکەوێتە سەر تا لە مەبەست دەگات ئەویش دەبێت لە ریگای (پراگماتیك)ەوە لێکدانەوەی بۆ بکرێت وەك:

- ئەو وڵاتە جوانەی خۆر لێی زیزە.

(برایەتی ل/١٠ ژ/٣١٨٣ لە ١٦/٩/٢٠٠)

ئەگەر بێتوو سەیری (کار)ی ئەم رستەیە بکەین کە (زیزبوون)ە دەبینین (کار)ێکی (تێنەپەر)ە و پێویستی بە (بکەر)ێکی زیندوو هەیە، بەڵام وڵاتێکی وەك: (قلەندا) دەبینین زیندوو نییە بۆیە ناگونجێت.

- هەموو شتێکی جوان لە شیعردا دەبینم.

(برایەتی ل/١٢ ژ/ ٣٠٩٩ لە ٢٨/٥/٢٠٠)

ئەم رستەیە کە (کار)ەکەی (بینین)ە و (بکەر)ەکەی (من)ە و (بەرکارە ناراستەوخۆ) یەکەی (لەشیعر)ە لەم رستەیەدا (کار)ەکە لەگەڵ (بکەر)دا دەگونجێت، بەڵام لەگەڵ (بەرکارە ناراستەخۆ) کە ناگونجێ، چونکە مرۆڤ توانای بینینی شتی هەیە لە هەندێ شت کە توانای دانەوەی وێنەیان هەیە وەك (ئاوێنە)، جا لەبەر ئەوەی (شیعر) توانای دانەوەی وێنەی نییە بۆیە بە نەگونجاو دادەنرێت.

- به هیوای کۆمپانیایەکی سینەمایە و راوە جنۆکەش دەکات.

(میدیا ژ/٨ ژ/٩٥ لە ٢٠٠١/٥/١٦)

کاری ئەم رستەیە (راوکردن)ە و (بکەر)ەکەی کەسی سێیەمی تاکە (ئەو) (بەرکار)ەکەش (جنۆکە)یە کە شتێکی میتافیزیکییە و بەردەست و بەرچاو نییە. تاکو ئێستاش ئەو راوکردنانەی کە زانراو و باوەن بریتین لە (راوە ماسی و کەروێشک و کەو و کۆتر و ریشۆڵە و هتد...) کەواتە (بەرکار) ەکە لەگەڵ (کار)ەکە نەگونجاوە، چونکە شتێکە بەر چاو نییە.

- رۆشنبیرانی عەرەب لە گوێی گادا نووستوون.

(باسەرە ژ/٣ ژ/٢٠ لە ٢٠٠٣/٩/١٠)

کاری ئەم رستەیە (نووستن)ە، (بکەر)ەکەش (رۆشنبیرانی عەرەب)ن، واتە (ئەوان) لێرەدا (بکەر) لەگەڵ (کار)دا گونجاوە، بەڵام لەگەڵ (تاوەلکاری شوێن) کە دەکاتە (گوێی گا) نەگونجاوە، چونکە شوێنێکی بچووک جێگای ئەوەندە کەسەی تیا نابێتەوە.

- رۆژنامەکان سوعاد حوسنیان کوشت.

( میدیا ژ/١٢ ژ/١٠١ لە ٢٠٠١/٨/١)

کاری ئەم رستەیە (کوشتن)ە و (بکەر)ەکەی (رۆژنامەکان)ە و (بەرکار)ەکەی (سوعاد حوسنییە) لەم رستەیەدا (کار)ەکە لەگەڵ (بکەر) دا ناگونجێت، چونکە (کار)ی (کوشتن) بە (بکەر) ێکی زیندوو دەکرێت نەك (رۆژنامە).

- کورێکی حەوت ساڵان منداڵی دەبێ.

(ئەمرۆ ژ/ ١ ژ/٢٩ لە ٢٠٠٣/٨/٢٠ )

(کار)ی ئەم رستەیە (منداڵبوون)ە، کە (کار) ێکی تێنەپەڕە و تەنها (بکەر)ی دەوێت کە (کورێکی حەوت ساڵانە) و هەروەك باوە (کار) ی (منداڵبوون) لەگەڵ (ئافرەت)دا دەگونجێت، بۆیە ئەم رستەیەش بنەمای هاوڕێتی بەزاندووە.

## ئەنجام:

١. واتای هاوڕێمتی واتایەکی شوێنی ناسۆییە و لە ئەنجامی بەیەکەوەهاتنی و هەڵکەوتنی لەگەڵ وشەی تردا دروست دەبێت و لە سنووری فرێز و ڕستەدا هەستی پێدەکرێت. هۆکارێکە بۆ نەبوونی هاوواتایی تەواو.

٢. پەیوەندیی هاوڕێمتی نێوان وشەکانی زمان پلەدارە هەندێ وشە هەمن رادەی بەکارهێنانیان بەرزە و هەندێکی تر نزمە، لێرەدا گەرمەی بە دەسەڵات بە تەواوی زاڵە بەسەر گەرمەی پێدەسەڵاتەکەدا، لەهەر شوێنێك دابێت ئەوا بە دوای خۆی رایدەکێشێت، ئەم ڕاکێشانەش پێی دەڵێن (کۆتی هاوڕێمتی).

٣. کاتێك وشە لێکگراوەکانی سنووری ڕستە ڕستەیەکی پەسەندیان داینێ، واتە لە رووی هاوڕێمتی و بەیەکەوە هاتن پەسەند بوون ئەوا پێی دەوترێت (ئاسایی واتا) کە لەسەر دوو بنەما کار دەکات: (ڕێزمانی ڕستە و پەسەندی واتا) و بەشێك لە واتای ڕستە لە ڕۆنانی سینتاکسیدایە و بەزاندنی پەیوەندیی ئاسۆیی لە سنووری ڕستەدا ئەوا (نائاسایی واتا) دێتە کایەوە کە لە رووی واتاوە پەسەند نییە، چونکە وشەکان مەرجی ڕێکەوتنیان تیادا نییە و شیکردنەوەی واتاکەی پابەند دەبێت بە واتای دەربڕاوی قسەکەر نەك واتای رووتی وشەکان و دەکەوێتە ئەستۆی (پراگماتیك).

٤. زمانی ڕاگەیاندن بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمای واتای هاوڕێمتی کاردەکات، چونکە زمانی ڕاگەیاندن دەبێت زمانێکی سادە و ساکار بێت و پێویستی بە لێکدانەوەی قووڵ نەبێت تا زۆرترین کەس لە چینی خوێندەوار تێی بگات و ئەرك نەخاتە سەر خوێنەر، ئەمەش بەوە دەبێت، کە وشەی گونجاو لە شوێنی گونجاو بەکاربێنێت.

٥. یەکێ لە ئەرکەکانی زمان ئەرکی هەست وروژاندنە بەتایبەتیش زمانی ڕاگەیاندن، جا زۆرجار ڕۆژنامەکان بۆ ئەوەی زیاتر خوێنەر بۆ خۆیان رابکێشن هەستیان دەوروژێنن کە لەسەر بنەمای پیادەکردنی واتای هاوڕێمتی دەبێت بە نەگونجانی کەسەکانی ناو ڕستە کە زیاتر لە سەردێڕەکان پیادە دەکرێت. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ ئەم ڕستانە لێکدانەوەی قووڵیان بۆ بکرێت، چونکە لە قسەی نائاسایی ناکات بەمەش گوێگر فورسایەکی زۆری دەکەوێتە سەر تا لە مەبەست دەگات، ئەویش دەبێت لە ڕێگای (پراگماتیك)ەوە لێکدانەوە بۆ بکرێت.

## پەراوێزەکـــان:

(١) jean action: 1993: 81.
(٢) وفاء محمد كامل: ١٩٩٧: ٢٢٦.
(٣) كلود جرمان و ريمون روبلان: ١٩٩٤: ٤٦.
(٤) بالمر: ١٩٨١: ٢٦.
(٥) لاينز: ١٩٦٨: ١٤.
(٦) ميشال زكريا: ١٩٨٣: ٢١١.
(٧) عزمي اسلام: ١٩٨٥: ٦٦.
(٨) سەلام ناوخۆش: ٢٠٠٥: ٣٤.
(٩) عبدالقادر هنى: ١٩٩٧: ٢٤٠.
(١٠) محمد معروف فتاح: ١٩٨٥: ٤٧.
(١١) محمد علي الخولي: ١٩٨٢: ٤٦.
(١٢) leech ١٩٧٤:٢٠.
(١٣) محمد محمد يونس: ١٩٩٣: ١٠٣.
(١٤) محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٩١.
(١٥) احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٤١.
(١٦) بێخاڵ عبدالله سعيد: ١٩٨٩: ١٩.
(١٧) طالب حسين علي: ٢٠٠٥: ٢١٠.
(١٨) لاينز: ١٩٦٨: ٤٠.
(١٩) Lievinson: 1997:126.
(٢٠) ميلكا اڤيتچ: ١٩٩٦: ٣٥٢.
(٢١) جون لاينز: ١٩٨٧: ١٣٢.

(٢٢) جوليا اس فالك: ١٣٧٧: ٣٤٩.

(٢٣) jean stilweell: 1999:4.

(٢٤) ڤيان سليمان حاجى: ٢٠٠١: ٩٧.

(٢٥) مامۆستا ڤيان سليمان حاجى ئەم زانياريانەی لە موحازەراتی بەرێز پ.د.محمد معروف فتاح وەرگرتووە.

(٢٦) نوال محمد عطية : ١٩٧٣: ٨٧.

**سەرەتا:**

وتای ڕەنگدانەوە تایبەتمەندییەکی زەقی زمان و  زمانی شیعرە، کە شاعیرانی (داشۆرین) بەکاری دەهێنن، وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی کە شاعیرێکی بێوێنەی کوردە لەم بوارەدا، کە تاکو ئێستا لە ئاستی سیمانتیکدا لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە، هەڵبژاردنی ئەم بابەتە لەلایەن توێژەرەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە تاکو ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر ئەم جۆرە واتایە نەکراوە کە باس لە وشە تابۆکان دەکات بە مەبەست و بێ مەبەست لە ئاخاوتنی ڕۆژانە بەکار دەهێنرێت. باسەکە لە ڕێگای شیکردنەوەی وشە هاوبێژەکان لە ئاخاوتن واتای ڕەنگدانەوە دەستنیشان دەکات، کە ئەو وشانە دەگرێتەوە کە یەکێ لە واتا بەکارهێنراوەکانی تابۆن و کەم بەکاردەهێنرێت.

## ١. چەمکی واتـــــــا

بەرای هەندێ لە زمانەوانانی وەک (سۆسێر و ئۆلمان) واتا بریتییە لە پەیوەندی نێوان (ناو ، ناولێنراو ) کە بە هێما دەنوێنرێ:




(هێما) ئەو نیشانانەیە کە مرۆڤ بۆ لە یەکتر گەیشتن یان وەک چەکێك بۆ بیرکردنەوە بە کاریان دێنێ.

(واتا) بۆچوونێکە بە بە هێما بەستراوە و کۆمەڵ بەکاریدێنێت

ئەم دوو رووەی هێما پەیوەندییەکی لەخۆوە بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە کە (ئۆگدن و ریچادس) لە سێگۆشەی ( (بیر)، (هێما) و (تەن) [٩] دا خستیانەروو.




فۆرم (هێما): زنجیرە دەنگێکی رێکخراوە، کە وشە پێکدێنێت.

بیر: واتە ناوەرۆك وەك (چەمك، وێنە و بۆچوون،....)

تەن: واتە شتی دەرەوە وەك: (کەس، شت، رووداو....)

خاڵی گرنگ لەم سێگۆشەیەدا ئەوەیە، کە پەیوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان (هێما و تەن) نییە.

## ٢. جۆرەکانی واتا

جۆرەکان واتا بە چەند شێوەیەك دابەشکراوە ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەبێت دابەشکردنەکەی (لیچ)ە، کە حەوت جۆرە واتا جیا دەکاتەوە:

### ١. واتای فەرهەنگی:

گرنگترین جۆری واتایەو نەگۆڕە و بەشێکە لە واتای فەرهەنگی وشە و لە شێوەی سیمای جیاکەرەوە خۆی دەنوێنێ وەك:




### ٢. واتای بارکراو

هەموو ئەو واتا زیادانە دەگرێتەوە، کە دەخرێتە سەر واتا فەرهەنگییەکە کە واتایەکی بگۆڕە و پلەی پێوانی کەم و زیادی هەیە. چەند جۆرێکە وەك:




### ٣. واتای شێوازی:

هەموو ئەو واتایانە دەگرێتەوە کە زانیاریمان دەربارەی قسەکەر دەداتێ لە پلەی خوێندەواری و نیش و کاری و دیالێکتەکەی و.... هتد وەك:



**٤. واتای دەروونی:**

ئەم جۆرە واتایە هەست و سۆزی قسەکەر دەردەبڕێ بۆ سەرسەرمان و نارەزایی...هتد و بەزۆری واتای هۆشەکی تێکەڵە وەك:




**٥. واتای رەنگدانەوە:**

ئەم جۆرە واتایە لە فرەواتا و هاوبێژدا دەبێت، کە یەکێ لە واتاکانی قەدەغە و تابۆیە.

**٦. واتای هاوڕێیەتی:**

بە پەیوەندی لە گەڵ وشەی تردا دێت و هاورێـیەتییەك دروست دەبێت لە نێوان دوو وشەکە و یەکیان ئەوی تر رادەکێشێ، بۆ نموونە وشەی (کاڵ) لە ئەنجامی بەکارهاتنی زۆر لەگەڵ (رەنگ، چاو، چا) ئەوا هاوڕێـیەتییەکیان پەیداکردووە.




**٧. واتای بابەتی:**

پەیوەندی بە رێکخستنی رستەو بە لوتکەکردنەوە هەیە بەگوێرەی مەبەست و گرنگی هەریەکەیان بۆ بارێك یان کاتێك دەبێت وەك:

- کەرەکە کەپرەکەی خست
- کەپرەکە کەرەکەی خست
- کەپرەکە کەوت

هەندێ جاریش لە سنووری یەك رستەدا بە هۆی هێزەوە مەبەست جەختی لەسەر دەکرێ[٢٤]

### ٣. لێڵ واتای وشە

لێڵ واتایی لە سنووری وشەدا ئەوەیە کە وشەیەک یان مۆرفیمێک بە تەنها ببیسترێ یان بخوێندرێتەوە گوێگر یان خوێنەر بە زیاتر لە مانایەک تێی بگات[٣]. ئەمەش پەیوەندی بە بەکارهێنانی وشەوە هەیە تا وشەیەک زیاتر بەکار بێت ئەگەری ئەوەی زیاترە ببێتە وشەی فرەواتا و هاوبێژ ئەمەش دەبێتە دوو جۆر:

#### ١. فرەواتا:

وشەیەکە زیاتر لە واتایەکی هەیە، بەڵام واتاکانیان لە بنچەوە لە یەک نزیکن و بەیەک وشە لە فەرهەنگدا دەنووسرێن[٤] وەک:

رۆژ (١) (رۆژەکانی هەفتە)
رۆژ (٢) (خۆر)




#### ٢. هاوبێژی:

ئەم وشانە دەگرێتەوە کە واتاکانیان لە یەکدوورن وەک:

مار(١) (ماڵ)
مار(٢) (مار)




ئەمیش دەبێتە سێ جۆر:

**أ- هاوپیت:**

بەو وشانە دەگوترێت کە لە نووسیندا یەکن، بەڵام لە گۆکردندا جیاوازن بۆ ئەم مەبەستەش هێز رۆڵێکی سەرەکی هەیە وەک:

دوو روو(١) (منافق)
دوو روو(٢) (وجهان)

**ب- هاوەدەنگە:**

ئەم وشانە دەگرێتەوە کە لە گۆکردندا لە یەک دەچن، بەڵام لە نووسیندا جیاوازن کە لە زمانی کوردیدا نییە وەک:

(1) (see) بینین

(2) (sea) رووبار

**ج- هاوبێژی تەواو:**

وشەیەکە چەند مانایەک دەدات، بەڵام واتاکانیان لەیەک دوورن[4] وەک:

نازار (١) (مانگی مارت).

نازار(٢) (ئێش و ژان).

**٤. واتای رەنگدانەوە:**

ئەم جۆرە واتایە لە بارێکدا دێت، کە وشەکە دواتی بێت یا زیاتر و جگە لە واتا فەرهەنگییەکەی واتایەکی تر بێنێتەوەیاد، کە تابۆ و قەدەغەکراوبن و هەندێ کردەی فسیۆلۆجی سێکسی بێنێتەوە یاد، هەندێجار بەمەبەستە و زۆرجاریش ئەم وشانە بێ مەبەست و بێ گوناهن[6].

واتا فەرهەنگییەکەی ئەم جۆرە واتایە بلاوترە، بەلام لەگەڵ ئەوەش (گوێگر) هەست بە واتا شاراوە و تابۆکەی دەکات [7]. ئەمەش وای کردووە، کە بەکارهێنانێکی کەمیان هەبێت و لە زمانی کوردیش لەبەر رەچاوکردنی باری کۆمەلایەتی و کەسی و ئەورووژاندنی بەرامبەرەکەی مرۆڤ زۆر لە رووی نایەت بەکاریان بێنێ و ئەگەر بەکاریشی بێنێت ئەوا هەندێ دەستەواژەی وەک (بلا معنى) (عەیب نەبی))تەشبیە نەبی (...هتد لەگەڵ بەکادێنێت، یان بە زمانێکی وەک عەرەبی دەگوترێت، بۆ نموونە بە ئەندانی زاوزێی نێرینە دەگوترێت (زەکەر).

(بلۆم فیلد) باوەڕی وایە لەبەر ناشایی یەکێک لە واتاکانی وشەکە لەگەڵ وشە قەدەغەکراوەکان وایلێدێت وشە ئاساییەکەش لە ناو بچێت.

بۆ نموونە وشەیەکی وەک (زێ) دوو واتای هەیە:

زێ(١) رووباری گەورە (واتای ئاسایی)

زێ (٢) زێی مێیینە (واتای قەدەغەکراو)

ئۆلمان ئەم جۆرە واتایەی کردووە بە بە سێ بەشەوە:

## ١. کارتێکردنی دەنگی کە دەبێتە دوو جۆر:

أ- کارتێکردنی راستەوخۆ:

ئەو وشە لێکدراوانە دەگرێتەوە کە لە دەنگە سروشتییەکان وەرگیراون وەک: قارە قار، تەقە تەق، گفەگف..........هتد.

ب- کارتێکردنی ناراستەوخۆ:

ئەو نیشانە و هێمایانە دەگرێتەوە، کە لە بواری ماتماتیکدا بەکاردەهێنرێت وەک:

## ٢. کارتێکردنی رێزمانی:

پەیوەندی بە وشە دارێژراو و لێکدراوەکان هەیە وەک:

أ- دارێژراو:

وەک: نووسەر،..........

ب- لێکدراو:

وەک: گەردەن بلوور،..........

## ٣. کارتێکردنی واتایی:

کە لە ئەنجامی گواستنەوەی واتای وشە سەرجا بیەکانەوە دەبێت کە لە رووی ئەرک یان شێوە لێکچوونێک بەدی دەکرێت [٨]:

أ- لێکچوون لە ئەرک:

وەک: ددانی مشار، باڵی فڕۆکە، پشتی دەرگا، .....هتد.

ب- لێکچوونی شێوە:

وەك: سەری مەنجەڵ، رووی مێز، قاچی کورسی، ...هتد. بۆ نموونە (ملی شووشە) لە هێماکاری هاتوچۆدا شۆفێری ئۆتۆمۆبیل لەوە تێدەگات کە رێگاکە تەسك دەبێتەوە: لە ئەنجامی ئەو لێکچوونەی کە لە نێوان ملی مرۆڤ و شووشەدا هەیە.

## ٥. سەرچاوەی واتای رەنگدانەوە:

بۆ هاتنە کایەی واتای رەنگدانەوە چەند هۆکارێك هەیە و گرنگەکانی ئەمانەن:

١. بوونی چەند زارێك لە زمانی کوردی و کە بەرێکەوت بوونەتە هاوبێژ و کە یەکێ لەواتاکانیش ئابۆین وەك:

دان (١) (دانی سێکسی)

دان (٢) (ددان)

٢. بە تێپەربوونی کات هەندێ وشە لە یەك دوورکەوتوونەتەوەو بوونەتە هاوبێژ. وەك:

دلگیر(١) (دلگرتن).

دلگیر(٢) (دلفرێن)

٣. دابرانی دوو وشە یا زیاتر بەسەر شتی جیاواز و بە رێکەوت شێوەی دەربرینیان وەك یەك بێت وەك:

گا(١) (گاجووت)

گا(٢) (سێکسی)

گا(٣) (پاشگر) وەك: سەیرانگا

٤. بوونی هەندێ وشەی لە زمانی بێگانە کە گۆکردنیان لەگەڵ وشە کوردییەکە وەك یەك بێت. وەك:

( کێر)(chair)(کورسی)

(کێر) ( ئەندامی زاوزێی نێرینە)

ـسوانی هەندێ دەنگ لە زارێك لە زارەكان ڕێكـەوتنیان بـە وشـەیەكی تـابۆ لـە زارێكی تر [٩]. بۆ نموونە، سوانی فۆنیمی (د) لە وشەی (سەد) لە زاری ( سـلێمانی ) و بوونی بە (سە) كە لە زاری هەولێر بەرامبەر بە (سەگ)ە.

سە(١) (ژمارە سەد)

سە(٢) (سەگ)

واتای ڕەنگدانەوە لە شیعرەكانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی

شعر بەرهەمێكی ئەدەبییـەو لـە ڕێگـای دەسـتنێوەردان لـە جیهـانی واتـاوە دەخوازرێ و لەسـەر بنەمای یاری ناوەكی بەندە كە بریتین لە (لێكچواندن و خـوازە و خواستن و دركە و ڕەگەزدۆزی [١٠]........هتد .

ئەوەی پەیوەندی بە باسەكەی ئێمـەوە هـەبێت وشـە (هاوبێـژ)ەكانـە لـە ڕێگـای هونەرەكانی ڕەوانبێژی دەچێتە ناو زمانی شیعرەوە و لەگەڵ واتـای ڕەنگدانـەوە یـەك دەگرێتەوە كە وشەیەك دەخوازرێ بۆ واتایەكی تر و دەبێتە هـۆی لێـل واتـایی و دوو دڵی و دوو مەبەسـت[١١] یەك (ئاشكراو) ئەویتر(شاراوە). هەروەك (نالی) ی دەڵێت:

نەزمی(نالی) میـلی ناو و ئایینەی ڕەنگی نییە

دووڕووە بۆ سەیری خاتر یەك خەفی، یەك ئاشكار

وشە (هاوبێژ)ەكان لە زمانی شـعردا جێگـای گرنگـی شـاعیرن و نرخێكـی زۆری هەیـە بـۆ یـاریكردن بـە وشـە لـە ڕێگـای واتـا جیاوازەكـانی بەتایبـەتیش واتـای (ڕەنگدانەوە) [١٢] و بە تایبەتیتریش بۆ كەسـێكی بلیمەتی وەك ( شێخ ڕەزا) نرخێكـی زیاتری هەیە، چـونكە ئـەم وشـانە زەوقـی ئـەدەبی زیـاتر دەكـەن و كاریگەرییـەكی تەلیسـماوی دەكەنە سەر گوێگر و وێژدانیان دەناخێوێت بەتایبەتیش ئەگەر ئەم وشـانە لە شوێنی گونجاو وە دابنرێت [١٣].

**ئەنجام:**

١. واتای رەنگدانەوە جۆرێکە لە و واتایەی کە لە وشەی هاوبێژ دا بەدی دەکرێت و واتایەکی ئاسایی و واتایەکی (تابۆ) ی هەیە لەبەر پەیوەندی بە کردەی سێکسی.

٢. واتای رەنگدانەوە لە زیاتر لە شیعری هەجوودا بەدیدەکرێت و شێخ رەزاش پێشەنگی ئەم هونەرەی شیعرە.

٣. واتای رەنگدانەوە بە شێوەی ناراستەوخۆ، بەمەبەستی وروژاندنی ئەوکەسانە بەکاردێت کە هەستی خراپ بەرامبەریان هەیە.

**پەراوێزەکان:**


١. منقور عبدالجليل: ٢٠٠١: ١٠٤ و بڕوانە: Oden & Richards:1965: 250

٢. د.محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٥٨-١٦٢.

٣. وريا عمر امين: ١٩٩٥: ١٣٦.

٤. كلود جرمان و ريمون رويلان : ١٩٩٤: ٤٠.

٥. د.محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٧٠.

٦. هەمان سەرچاوە: ١٦١.

٧. احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٤٠.

٨. هەمان سەرچاوە: ٣٩-٤٠

٩. نەورەحمانی حاجی مارف: ١٩٧٥: ١٨-١٩.

١٠. عبدالخالق يعقوبى: ٢٠٠١: ٢٤.

١١. أ.ب.فولكس: ١٩٨٦: ٣٤.

١٢. محمد عزام: ١٩٩٤: ١٤١.

١٣. محمد محمد يونس: ١٩٩٣: ١٩٨.

## ١- دژواتا:

دژواتا گرنگترین پەیوەندییە واتاییەکانە، کە پەیوەندییەکی شوێنی ستوونییە بەواتای ئەوەی لە چوارچێوەی زماندا کاردەکات. هەریەك لە وشەکان ئەچنە ژێر ئەو پۆلە ستوونییەوە کە لە ڕستەدا دەنوێنرێت[١].

دژواتا لای عەرەبەکان بریتییە لە یەك وشە دوو واتای جیاواز بگەیەنی وەك: (جون) کە دوو واتای دژیەکی هەیە (رەش- سپی) [٢]، بەڵام لای زمانەوانە نوێیە ڕۆژئاواییەکان بریتییە لە دوو وشەی جیاواز کە دژیەکبن لە واتا وەك: (کورت —درێژ) (جوان-ناشیرین)[٣] لە کۆنەوە دژواتا جێگای بیروڕای جیاوازی زمانەوانەکان بووە هەندێ جار بە تەواوکەری هاوواتایان داناوە، چونکە زۆرجار واتای وشە بە دژەکەی لێکدەدرێتەوە لەکاتێکدا ئەم دوو پەیوەندییە شوێنییە جیاوازن لەبەرئەم هۆیەش زمانەوانەکان نەیانتوانیوە گرنگی تەواو بدەن بە جۆرە جیاوازەکانی[٤]. بە پێی بیروڕای جۆن لاینز دژواتا سێ جۆرە: (بەرامبەری و پێچەوانەیی و تەواوکاری).

## ٢- جۆرەکانی دژواتا:

### أ- بەرامبەری

ئەم پەیوەندییە لە بەراوردکردنی هەندێ وشەی وەك: (نێر-مێ) دا دەردەکەوێت کە ڕەتکردنەوەی یەکێکیان پەسندکردنی ئەویتریانە هەروەها بە پێچەوانەوە. بۆ نموونە کە دەڵێین ئەو کۆترە نێرە ئەوا ئەمە ڕاستییەمان ڕەتکردۆتەوە کە مێ بێت بە پێچەوانەشەوە کە دەڵێین ئەوکۆترە نێرنییە ئەوا ئەوەمان پەسندکردووە کە کۆترەکە مێیە. کەواتە پلە نییە لە نێوان نێرومێدا هەریەکەیان جەمسەرێك دەگرن ئەوەی لەم جەمەمسەرە نەبێت لە جەمسەرەکەی ترە[٤]. بەرامبەری بارێکی تایبەتی پەیوەندی جیاوازییە کە لە نێوان دوو کەرەسەدا هەیە جیاوازیش وەك لەمەودوا ڕوونی دەکەینەوە سەلماندنی هەر یەکێك ناکردنی یەکێکە لە دانەکانی تری کۆمەڵەکە لە کاتێدا کە بە جیاجیا وەریانبگرین وەك: (سوور شین سەوز ڕەش .....هتد) کە

نـاکردنی هـەر دانەیـەك لـە کۆمەڵەکـە هەڵبـژاردنی یـەکێك لـە ئەندامـەکانی تـر دەگرێتەوە.(سوور یان سەوز یان شین یان زەرد.....هتد) کە ئەو کۆمەڵانـەی کـە لـە دوو کەرەسەی جیاواز پێکهاتوون هەریەك لە کەرەستەکان یەك کەرەسە بەرامبەریانە وەك (نێر — مێ)، بـەڵام ئـەو کۆمەڵانـەی لـە چەند کەرەسـتەیەکی جیـاواز پێکهـاتوون ئـەوا کەرەستەیەك یان زیاتر بەرامبەرییەتی. خاڵێکی تریش لەم جۆرە پەیوەندییە ئەوەیە لەبەر بەکارهێنانی دوو زاراوەی وەك (کوڕ) و (پیـاو) ئەگەر وەك بەرامبەرێك تەماشـای بکـەین پێویستە لە سەرەتاوە کە بە پێی پێوەرێکی پەسندکراو لە رووی شارستانییەتەوە کـە ژن هێنانە دانراوە کوڕ ئەبێ توانای ژن هێنانی هەبێت ئینجا ئەبێت بە بەرامبەر بـۆ پیـاو[٩] دیـان دەبیـنین شـتێکی ئاسـاییە کـە نـاکردنی یـەکێك پەسـندکردنی ئـەوی تریانـە و پەسندکردنی یەکێکیان ناکردنی ئەوی تریانە لە کاتێکدا دەتوانرێت کـە یـەکێکیان یـان هەردووکیان بە تەواوی رەتبکرێتەوە. بۆ نموونە دەتوانین هەردوو زاراوەی (نێـر-مـێ) کـە هەریەکەیان رەگەزێك دیاریدەکەن و پەیوەستن بە چەند تایبەتییەکی بایەلۆجی و رەوشـتی دەتوانرێت زاراوەی (نێرەموك) بەکاربهێندرێت کە کەسێکی نە نێر و نەمێیـە [٧]، بـەڵام ئەم بارە ناوێزانە نابێت وامان لێبکات پاشگەزبینەوە لە بۆچوونەکانمان دەربارەی ئەم جۆرە دژواتایە. جگە لەمەش هەندێ لەم جۆرە دژواتایانە ناوەڵناون ئەدگاری جۆری پێچەوانەیان هەیە وەك: (پاکزاد- فێڵباز) (گوێڕایەڵ-لاسار) (کراوە-داخراو) ئەمانە دەتوانین پلەیان بۆ دابنێین جا زۆرتر یان کەمتر لەگەڵ ئەوەش ناکردنی یەکێکیان پەسندکردنی ئەوتریان نییـە بۆ نموونە کە دەڵێن رۆژگار گوێڕایەڵترە لە رزگار مانای ئەوە نییە رزگار لاسارە یان کاتێك دەڵێن رزگار لاسار نییە مانای ئەوە نییـە گوێڕایـەڵ نییـە، کەواتـە ئـەم ناوەڵناوانـە لـە ناوەخۆیاندا پلەدارن. جگە لەمەش هەندێ لەم جووتە بەرامبەرانە هەروەك سـایێر ئاماژەی بۆ دەکات ناتوانرێت بگۆڕدرێتەوە، واتە پەیوەندی زۆرتر یان کـەمتر لەسـەری ناچەسـپێ وەك (زیرەك-تەمبەڵ) چونکە زۆر زیرەك یەکـسان نییـە بە تەمبەڵ و کەم تەمبەڵ یەکـسان نییە بە کەم زیرەك لەگەڵ ئەوەش هەردوو وشەکە پلەدارن و نرخێکـی رووتیـان هەیـە لـە یەکێ لە هەردوو کۆتایی پێوەرەکە[٨].

**ب- پێچەوانەیە:**

ئەم پەیوەندییە لە بەراوردکردنی وشەی (چاك-خراپ) و (گەورە-بچووك) دەیان وشەی تردا دەردەکەوێت ئەم جۆرە دژواتایە بەوە لە بەرامبەری جیادەکرێتەوە کە پلەدارە، واتە دوو وشەکە بەراورد دەکرێت[9] ئەم بەراوردەش لەوانەیە ئاشکرا بێت یان درکاو بێت، بەراوردی ئاشکراش دوو جۆرە[10]:

أ- بەراوردی ئاشکرا کە لە نێوان دووشت یان دووکەس دایە و پەیوەندی بە بابەتێکی دیاریکراو هەیە، بەڵام یەکێکیان پلەیەکی بەرزی هەیە وەك:

- خانووەکەمان لە خانووەکەی ئێوە گەورەترە.
- سازگار ئیمساڵ لە پار زیرەکترە.

هەندێ جار دەتوانین ئەمومژێك بەجێ بهێڵین کە خوێنەر لای روون ئەبێت بەوەی کە بەراوردەکە لە نێوان دووکەسدایە یان دوو باردایە وەك:

- ئازاد وریاترە یان لە پاری خۆی یان لە رزگار.

دەشتوانین هەردوو جۆرەکی پێشوو لە یەك رستەدا کۆ بکەینەوە ئەم جۆرە بەراوردییە سەرزاری دەردەبڕێت وەك لە رستەکانی سەرەوە باسمانکرد بە هۆی ئامرازی (تر، لە )وە دەرکەوتووە وەك:

- خانووەکەمان لە جارانی خانووەکەی ئێوە گەورەترە.
- ئازاد لە جارانی خۆی وریاترە.

ب- بەراوردی درکاو: ئەم جۆرە بەراوردییە شاراوەیە و دەرنەبڕاوە، بۆ نموونە کە دەڵێین:

- شیلان قوتابییەکی زیرەکی پۆلەکەیەتی.

مەبەستمان ئەوەیە لە هەندێکیان زیرەکترە و هەندێکیش لەم زیرەکترن، بەڵام بەراوردەکە سەرزارییە و دەرنەبڕاوە. هەندێجاریش ئەم وشە دژانە پلەکانیان بزر دەکەن و کەم و زۆر هەست بەوە ناکەین بەراوردەکە لە ئارادایە یان نا وەك:

- خانوودکەت چەند گەورەیە؟

- چەمەکە چەند قووڵە؟

ئەم رستانە ئەوە ناگەیەنێ خانووەکە گەورەیە یان چەمەکە قووڵە، بەڵکو لە رۆنانی وادا وشەکان پلەکانیان ون دەکەن بێ لایەن دەوەستن[11].

لە رووبەکی تریشەوە وشەی دژواتا بەوەی لە وشەی جیاواز جیادەبێتەوە لە دژواتا یەکێ لە وشەکان رەتدەکەینەوە مانای ئەوە نییە ئەوەکەی ترمان پەسند کردووە، بۆ نموونە کە دەڵێن:

- پیاوێکی ئازا نییە.

مەرج نییە پیاوێکی ترسنۆک بێت. بەواتایەکی تر وشەی دژواتا خۆیان جەمسەردکان دەگرن بەڵام لە نێوانیاندا پلە هەیە. بۆیە ئەگەر یەکێکمان هەڵبژارد ناچار نابین ئەوی تر هەڵبژێرین، چونکە دەتوانین پەنابەرینە بەر پلەکانی نێوانیان[12].

ساپێر دەڵێ پێویستە لەسەرمان ئەو وشانە وا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەین بەپێی پلە و شێوەی بەراوردی ناوەڵناوەکە وەك: (درێژ -درێژتر- .........درێژترین)، بۆ نموونە کاتێك دەڵێین رێگایەك درێژ نییە لە رێگایەکی تر یان مرۆڤێك پیرترە لە مرۆڤێکی تر و لە پێوەری پلەی بەراوردی دادەنێین بە پێی چەند پێوەرێکی جۆراوجۆر بە گوێرەی کەرەستە مەبەستدارەکان.

بۆ نموونە کاتێك دەڵێین:

- چەند کەسانێکی زۆر ئامادەنەبوون.

ئەمە وادەگەیەنێ (٥-٦) کەس ئامادە نەبوینە ئەگەر باس لە دانیشتنێکی تایبەت بکرێت، بەڵام لەوانەیە (٢٠٠٠) کەس بگرێتەوە ئەگەر باس لە یارییەکی تۆپی پێ بکرێت. لە یەکێ لە یاریگاکان. کەواتە پێوەر شتە وەسفکراوەکە دیاریدەکات[13].

### ج- تەواوكەری

ئەم جۆرە پەیوەندییە بە بەراوردكردنی هەندێ وشەی وەك (كڕین — فرۆشتن) و (دان —وەرگرتن) و (ژنهێنان — شوكردن) دا دەردەكەوێت [14] پەیوەندی تەواوكەری لەگەڵ جۆری بەرامبەریدا یەكدەگرنەوە، بۆ نموونە:

- ئازاد خانووەكەی لە رزگار كڕی.

واتە

- رزگار خانووەكەی فرۆشتە ئازاد

لەم نموونەیەی پێشوودا تاكێك لە دوو وشە بەرامبەرەكە لە رستەیەكدایە و تاكەكەی تری لە رستەكەی تردایە ئەم دیاردەیەش پەیوەندی بەو گۆڕانە ڕێزمانییەوە هەیە، كە لە هەردوو رستەكەدا روودەدات، ئەم وشانەی كە تایبەتن بە پەیوەندی خزمایەتی و پلەوپایەی كۆمەڵایەتی نموونەی زۆرمان دەدەنێ لەسەر پەیوەندی تەواوكەری وەك:

- كاوە خاڵۆزای ئەوزادە.

واتە

- ئەوزاد پورزای كاوەیە.

هەندێ كەرستەی فەرهەنگی هەیە، كە پەیوەندی گۆڕینەوەی تەواوكەری لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام ناتوانین بە تەواوكەری دابنێین وەك:

- مامۆستا لە قوتابی پرسی.
- قوتابی وەڵامی مامۆستای داوە.

چونكە لەوانەیە وەڵامی دابێتەوە یان نەیدابێتەوە یان لە رستەی:

- رزگار دیاری دا بە رۆژگار لەوانەیە ئەوە بگرێتەوە [15].
- رۆژگار دیارییەكەی وەرگرت.
- رۆژگار دیارییەكەی رەتكردبێتەوە.

هەروەها ئەم تايبەتييە گۆڕينەوەی لە نێوان ڕستەی بکەردیار و ناديــاردا هەيــە هەمان پەيوەندی تەواوكارييە، چونكە بــوونی كــاری ناديــار نيــشانەی بــوونی كــاری دیارە، بۆ نموونە كە دەڵێين:

- پۆليــسەكە دزەكەی كوشت. ئەوە دەگرێتەوە:
- دزەكە كوژرا بە دەستی پۆليــسەكە. لێرەدا تێبينييــەی گــرنگ هەيــە، كــە بريتييە لــەوەی پەيوەندييــەكانی خزمايــەتی هــەموو كاتێــك پەيوەنــدی گۆڕينــەوەی ڕێكوپێكيان نابێت، بۆ نموونە كە دەڵێين:
- ئازاد باوكی شيلانە. ئەوە ناگەيەنێ
- شيلان كوڕی ئازاد بێت    هەروەها كە دەڵێين:
- رزگار كوڕی ئەسرينە ئەمەش ئەوەناگەيەنێ:
- ئەسرين باوكی بێت، بــەڵكو دايكييــەتی ئەمــەش بــۆ ئــەوە دەگەڕێتــەوە پەيوەندييە دووقۆڵييــەكە لە نێوان كوڕ و (باوك و دايك) دايە.

**د- دژواتای يەك وشەيی:**

لە زمانی كورديشدا هەروەك زمانی عەرەبی واتای دژيەك لە يەك وشەدا دەبينێت ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەمومژێك دوروست بكات لە زماندا كــە دەگەڕێتــەوە بــۆ گەشە و گۆڕانی زمان و بــوونی ئــەم وشــانە بــە فرەواتــا و هاوبێــژ تــا ڕادەی دژواتــا واتاكانيان دوور كەوتۆتەوە ئێستاش ئەم دوو واتايە بەيەك ڕێژە بەكار نايــەت، بــەڵكو واتا ئرێيــەكەی بەسەر ئەويتر زاڵە. بۆ نموونە وشەی دڵگیر ســەرەڕای ئــەوەی بــەواتای عاجزبوون دێت دوو واتای تريشی هەيە (دڵگير — ڕاڵێبوون ) (دڵگير _ دڵ پەستكەر) هــەروەها وشــەی (گــوێگرتن ) (گوێپێنــەدان _ گــوێ شــلكردن). هــەروەها وشــەی (لێگــەڕان) دوو واتــای دژی هەيــە (بەدواداگــەڕان _ وازهێنــان) ديــان وشــەی (لەبەركردنەوە ) (داكەندن _ لەبەركردن) (گێڕاوە) سەرەڕای واتای پێڕاگەياندن واتــای

(ڕەتکردنەوە_ وەرگرتن) یش دێت سەرەڕای ئەمانەش لە زمـانی کوردیـدا شـاعیران هەندێ وشە بە پێچەوانەکەیان بەکارهێناوە وەك نالی دەڵێ:

دڵ دەڵێ سەیری چەمەن خۆشە جەوابی نادەم
موددەتێکە لە قەفەسـدایە عەزابی نادەم [16].

لێرەدا جەوابی نادەم بەواتای دڵنەشکاندن دێت و بە دژواتاکەی خۆی بـەکارهاتووە جگە لەمەش دەبینین زۆر لە شاعیران نازناوی خۆیان بـە واتـا دژەکـەی بـەکارهێناوە هەروەك سالم-ی شاعیر بۆ شوکرانەی نیعمەت ناوی سالمی لەخۆوەناوە کەچی زۆرلات و هەردەم نەخۆش بووە.

زۆرجاریش وشە بە مەبەستە پێچەوانەکەی دەردەبڕدرێ، وەك ئـەوەی بەکەسـێکی تەمەڵ بڵێی زیرەك و بەکەسێکی درێژ بڵێی کورت و بە جوانێك بڵێی ناشیرین.

ئەنجام

دژ واتا پەیوەندییەکی شوێنی ستوونیە جگە لەم سێ جۆرەی کە جۆن لاینز دابەشی کردووە، جۆرێکی تر بەدیدەکرێن لە زمانی کوردیدا ئەویش دژواتایی لەیەك وشە کە لە ئەنجامی گەشە و گۆڕانی زمانەوە هاتۆتە ئاراوە بەڵام هەردوو واتاکەی بەرێژەیەکی یەکسـان بەکارنایەتی بەڵکو واتایەکیان زاڵتر، بەسـەر ئەوی تر وەك دڵگیر دوو واتای دژیەکی هەیە:

١- دڵپەسـنکەر.

٢- دڵفڕین.

ئێستا واتای دووەمی زاڵە بەسـەر واتای یەکەمی.

## پەراوێزەکان


١. بێخاڵ عبداللە سەعید: ١٩٨٩: ٦٩.

٢. نوال کریم زرزوور: ١٩٨٩: ١٨٨.

٣. احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ١٩١.

٤. جون لاینز: ١٩٦٨: ٩٥.

٥. محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٩٥.

٦. بێخاڵ عبداللە سەعید: ١٩٨٩: ٨٤.

٧. جون لاینز: ١٩٦٨: ٩٧.

٨. اف.ار.پالمر: ١٩٨٥: ١١٢.

٩. محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٩٥.

١٠. بێخاڵ عبداللە سەعید: ١٩٨٩: ١٨٦.

١١. محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٦٠.

١٢. اف.ار.پالمر: ١٩٨٥: ١٥٩.

١٣. محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٦٧.

١٤. سەرچاوەی پێشوو: ١٥٩.

١٥. بێخاڵ عبداللە سەعید: ١٩٨٩: ٨٨.

١٦. محمد نوری عارف: ١٩٨١: ١٤.

**سەرەتا:**

دیاردەی هاوواتا کە بەشێکی گرنگی پەیوەندییە واتاییەکانە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە سەر فەرهەنگی زماندا بۆ روونکردنەوەی واتای وشەکان و فراوانبوونی واتا و مەبەست بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا. بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێکی زۆر لە وشە لە روانگەی دانەری فەرهەنگەوە هاوواتان بۆ یەکتری، هەرچەندە ناتوانین ئەم جۆرە وشانە بە هاوواتا دابنێین، چونکە فەرهەنگ ئەم وشانە بۆ وەسف و روونکردنەوە لای خوێنەر بەکاردەهێنێ بۆیە زیاتر ئەم وشانە وا باشە لە خانەی گرتنەوە دا دایان بنێین. هەرچۆنێك بێت فەرهەنگ زۆر بەدەگمەن پشت بە هاوواتا دەبەستێت، چونکە سوودێکی کەمی دەبێت ئەگەر هەردوو وشەکە لای خوێنەر نەزانرا، هەرچۆنێك بێت نکوڵی لە بوونی هاوواتا ناکرێت و بە شێوەیەکی گشتیش بەم دوو شێوەیە پێناسە دەکرێت:

- دوو وشە یا زیاتر کە یەك واتا ببەخشن.
- دوو وشە یا زیاتر کە یەك واتا ببەخشن و لە بری یەکتریش بێت لە گوتندا[1].

## ١. شێوەکانی هاو واتا:

هاوواتا بەپێی دارشتنی چەند شێوەیەکی هەیە کە ئەمانەن:

**أ– وشەی سادە:**

کە هیچ پێشگر و پاشگرێکی لەگەڵدا نییە.

وەك:

پاك: خاوێن

بەرز: بڵند

شێوە: روخسار

شوێن: جێگا

جوان: قەشەنگ

**ب- وشەی داڕێژراو:**

کە پێکهاتووە لە وشەیەکی سادە لەگەل پێشگرە یا پاشگرێك.

وەك:

ڕێکەوت: هەلکەوت

لەبەین: لە نێوان

ڕۆشنایی: ڕووناکی

**ج- وشەی لێکدراو:**

واتا لە دوو وشەی واتاداری لێکدراو پێکهاتووە.

وەك:

گیروگرفت: تەنگ و چەڵەمە

دەستنیشانکردن: دیاریکردن

دەربازبوون: ڕزگاربوون

**٢. هاوواتا بە پێی بەشەکانی ئاخاوتن**

**١. ئەوانەی "ناو"ن:**

دەفتەر: پەراو

کتێب: پەرتووك

وشە: واژە

شاعیر: هەستیار

ئامانج: هیوا

ڕۆندك: فرمێسك

ڕۆژ: خۆر

### ٢. ئەوانەی "ناوەڵناو"ن :

کەورە: مەزن

ژیر: عاقل

بچووک: گچکە

دژوار: خراپ

هەژاری: فەقیری

دەوڵەمەند: لۆرت

### ٣. ئەوانەی "کار"ن:

دەچم: دەرۆم

دەنووم: دەخەوم

کرین: سەندن

### ٤. ئەوانەی " ئاوەڵکار" ن:

لەسەر: لەبان

لەتەک: لەتەنیشت

### ٥. ئەوانەی "ئامراز" ن

بۆ: لۆ

ئەم: ئەو

### ٦. وەك جێناو:

من: ئەز

تۆ: ئەتو

## ٣. هاوواتا لە نێوان بوون و نەبووندا

هاوواتا کە پەیوەندییەکی شوێنی ستوونییە بە واتای ئەوەی لە چوارچێوەی زماندا کار دەکات لە کۆنەوە جێگایی موشتومڕی نێوان زمانەوانەکان بووە لەسەر بوون و نەبوونی لە راستیشدا زۆرگرانە کە دوو وشە بەیەك واتا بێنێتەوە لە زماندا، چونکە ئەمە لە توانای زمان کەم دەکاتەوە بۆ ئەم مەبەستەش کۆنترین پەرتووکی عەرەبی کە (هاوواتا)ی تێدا باسکرابێت: ( الالفاظ المترادفة و المتقاربة في المعنى) یە لەلایەن ( ابي حسن علي بن عيسى الرماني) وەکونترین نووسەری عەرەبیش کە دیاریدەی (هاوواتا)ی بەکار هێنابێت: (ابو حسين احمد بن فارس) لە کتێبەکەیدا بەناوی (الصاحبي) سەبارەت بە بوون و نەبوونی جیاوازییەکی فراوان لە بیورایی نووسەرە عەرەب و بێگانەکاندا هەیە کە لە دوو کۆمەڵەدا خۆی دەنوێنێت [٢].

### کۆمەڵەی یەکەم:

بریتییە لەو کەسانەی کە سەلماندنیان ئەم دیاردەیە هەیە و وتیان هەموو خاوەن زمانێك ئەگەر بیەوێت وشەیەك روون بکاتەوە ئەوا بە هۆی هاوواتاوە روون دەکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستە پشتیان بە چیرۆك و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بەستووە، هەروەها دەگێڕنەوە کە (ابن خالويه) شانازی کردووە بەوەی کە (٥٠) ناوی ( شیری) لەبەرە بۆ ئەم مەبەستە دوو کتابی دانا کە تیایدا (٢٠٠) ناوی بۆ (مار) کۆکردۆتەوە بۆ ( شیری) (١)یش (١٠٠) ناوی کۆکردۆتەوە (الرماني) کە یەکێکە لەوانەی کە بڕوای بە بوونی هاوواتا هەبووە و کتابێکی داناوە لە ژێر ناوی ( الالفاظ المترادفة و المتقاربة في المعنى) کە دابەش کراوە بۆ (١٤٠) بەش، کە هەر بەشەی بۆ ئەو وشانە تەرخانکردووە کە یەك واتایان هەیە، هەروەها (ابن فارس) یش یەکێکە لەوانەی کە بڕوای بەبوونی (هاوواتا) هەیە و دەڵێت[٣]:

"هەر وشەیەك ئەگەر ئەو مانایە نەگەیەنێت کە بۆی دانراوە ئەوا وشە و دەستەواژەکە بە هەڵە دانراوە" دیارە ئەوانەی دان بەبوونی هاو واتا دەنێن، دوو دەستەن:

**دەستەی یەکەم:**

کە چەمکی ماناکەیان فراوان کردوونەیان بەستنەوە بە هیچ بنەمایەک.

**دەستەی دووەم:**

کە بەستیانەوە بە چەند مەرجێك هەروەك (الرازي)کە دەڵێت:

دەبێت دوو واتا کە وەك یەك بێت هیچ جیاوازی یەك، بۆیە (السیف-الصارم) هاوواتا نین، چونکە هی دووەم واتاکەی زیاترە. هەروەها (اصفهانی) بیروڕای وایە، کە هاوواتایی راستەقینە ئەوەیە کە لە یەك زاردا هەبێت نەك لە دوو زاردا[4]. لە زمانە بیانییەکانیشدا بە شێکی زۆرکەم دان بە بوونی (هاوواتا) دادەنێن ئەویش بە بەستنەوەی بە چەند مەرجێك یان بە شێوەیەکی تەسك و یان بەرێ پێدانێکی کەم.

جۆری یەکەم··· ئۆلمان Ullmann کە دەڵێن لەوانەیە کە ئاسایی بێت کاتێك کە بڵێین هاوواتا تەواو نییە یان بە دەگمەن روو دەدات، چونکە زمان ناتوانێ بە ئاسانی پێش کەشی بکات تەنها لەو وشانە نەبێت، کە دەتوانرێت لە شوێنی یەکتری بەکاربهێنرێت لە هەر چوارچێوەیەك دابێت بە بێ جیاوازی. ئەگەر هاوواتایی تەواویش روویدات ئەوا بۆ ماوەیەکی کورت و دیاری کراو دەبێت[5].

جۆری دووەم··· کە کۆمەڵەی لیرەر Leherer دەڵێت کە تەنها ئەوە بەسە دوو وشە کە لە شوێن یەکتری بەکاربهێنرێت لە زۆربەی چوارچێوەکاندا و جیاوازی لە واتای شێوازی نابێتە ئەگەرە لە رێگای هاوواتایی بوونیان[6].

جۆری سێیەم ... کە (ابراهیم انیس) چەند مەرجێکی داناوە بۆ هاو واتایی بوون وەك:

١. یەکیەتی سەردەم: واتە نابێ بڕوانینە سەردەمەکانی زمان بەیەك چاو، چونکە تێپەربوونی کات جیاوازی زۆر لە واتادا دروست دەکات هەندێ جاریش وا دەکات لێك نزیك بنەوە جیاوازی یەکە بیر بکرێت.

٢. یەکیەتی شوێنەواری زمان: واتە هەردوو وشەکە سەر بەیەك شێوە زار بن یان کۆمەڵێکی گونجاو لە شێوە زارەکاندا.

٣. ڕێکەوتن لەسەر مانایی هەردوو وشەکە: دەبێت ڕێککەوتێکی تەواو هەبێت و بە لایەنی کەمەوە لەگەڵ بیری زۆربەی زۆری خەڵك بگونجێ.

٤. جیاوازی وێنەی دەنگی: هەردوو وشەکە بە شێوەیەك نەبن کە یەکێکیان ئەنجامی گۆڕانی دەنگی ئەویتریان نەبێت[٧].

**کۆمەڵەی دووەم:**

کە بریتییە لەوانەی کە نکۆڵی لە سەر بوونی دەکەن، کە لە نووسەرە عەرەبەکان (ثعلبي) لە سەرووی هەموویان دێت دوایش (ابو علی الفارس – ابن فارس –ابو هلال العسکری ٠٠٠٠٠هید ) ابن فارس دەڵێت: (السیف) (شیر) یەك مانایی هەیە ناوەکانی تر سیفاتن.

ابو علی الفارس دەڵێت: (هیچ مانایەکی تری (شیر)م لەبەر نییە جگە لە(شیر) ناوەکانی تر وەك: (الصارم- مهند ٠٠٠ هید) هەمووی سیفاتن [٨]. (ابو هلال العسکری) کە کتێبێکی داناوە لەژێر ناوی (الفروق فی اللغه) بۆ نکۆڵی کردن لە بوونی هاوواتاوە چەسپاندن جیاوازی نێوان ئەو وشانەی کە بە هاوواتا دانرابوون وە دەڵێت: هەر شتێك یەك ناوی هەیە ئەگەر ئاماژەی بۆ کرا بە ناوێکی تر ئەوا زیادەرۆیی و بێ سوودە، چونکە نابێت دوو وشە یەك واتایان هەبێت وەناشبێت یەك وشە دوو واتایی هەبێت، لەبەر ئەوەی ئەو زیادەرۆییە لە زماندا هیچ گرنگی نییە[٩]. (محمود فهمی الحجازی) دەڵێت: هیچ کاتێك دوو وشە یان زیاتر ڕێك ناکەوێت واتاکانیان تەواو و یەك بن، بەڵام لە هەندێ وشەدا مەبەستەکانیان لێك نزیك دەبنەوە، لە نووسەرە بێگانەکانیش، (ئەرستۆ) یەکەم کەس بووە کە باوەڕی بەبوونی ئەو دیاردەیە نەبووە وتویەتی هەڵەیە ئەگەر بڵێین دانانی زاراوەی جیاواز بەیەك واتا هیچ نابێتە گۆڕان لەو واتایەدا، چونکە هەندێك زاراوە هەیە شیاوترە لە یەکێکی تر و زاراوەش هەیە زیاتر واتایی مەبەستەکە دەگەیەنێت و ڕوونترە لە یەکێکی تر، ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (نۆڵدکە) و (فیرث) بەلایانەوە ئەو وشانەی کە بۆ یەك شت بەکاردەهێنرێن تایبەتییەکانی ئەو شتەن لە پاڵ واتا بنچینەییەکەدا[١٠]. هەروەها (بلۆم فیلد)، لەوبارەیەوە دەڵێت: لەبەر ئەوەی دوو کەرەسە لە ڕووی پێکهاتنی دەنگییەوە جیاوازن پێویستە واتاکانیشیان

جیاوازییت، و (جۆرج) دەڵێت: ئەگەر دوو وشە هاوواتابوایە لە هەموو لایەنێکەوە هیچ پێویستی نەدەکرد کە دوو وشە بەیەکەوە بێت. هەروەها (لیّرەر) دەڵێت: ئەگەر لێکچوونی تەواو لەنێوانیاندا هەبێت ئەوا ناچم بە هاو واتایی، بەڵام لەوانەیە چەند وشەیەك لەیەك بچن بە شێوەیەك کە بتوانرێت ئالوگۆڕیان پێ بکرێت لە بەشێك لە واتاکانیاندا. و (گودمان) دەڵێت: هیچ دوو وشەیەك نییە کە بتوانین شوێنی یەکتر بگرنەوە بێ ئەوەی واتا راستەقینەکەی نەگۆڕێت. و (لاینز) دەڵێت: ئەگەر مەرجمان دانا کە هاوواتا دەبێت دوو دەربڕینی وەك یەك بێت و بتوانرێ شوێنی بگۆردرێت لە هەموو قەکردنێکدا ئەوا بە ئاسانی دەتوانین بڵێین کە دوو دەربڕین لە هیچ زمانێکدا هاوواتا نابێت و (ستروك) دەڵێت: هەموو وشەیەك کاریگەرییەکی سۆزی و هێمایی هەیە بۆیە مەحالە هاو واتایی تەواو لە زماندا هەبێت[11].

لەسەرەوە زۆربەی بیروڕایی نووسەرانمان خستەروو جا وەك دەردەکەوێت ئەبوونی پێناسەیەکی دیاری کراو بۆ هاوواتا و جیاوازی فراوانی بیروڕایان و جیاوازی ئەو مەرجانەی کە دایان ناون بۆ دەرکەوتنی هاوواتا.

بۆیە دەتوانین بڵێین: ئەگەر مەبەستمان لە هاوواتا بەرامبەری تەواوی وشە بێت و بتوانین لە شوێنی یەکتری بیان گۆڕینەوە و بەکاریان بهێنین بۆ ئەوەی هیچ جیاوازییەك لە نێوانیاندا هەبێت لە واتای هۆشەکی و شێوازی هەموو جۆرەکانی واتا و لەیەك زمان و ئاستی زمان و لەیەك ماوەی کاتی و لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵێکی یەك زمان ئەوا هاوواتا نییە[12]، بەڵام ئەگەر مەبەستمان لە هاوواتا بەرامبەری بێت تەنیا لە واتایی هۆشەکیدا ئەوا دەتوانین زۆر وشە بدۆزینەوە کە لە واتایی هۆشەکیدا وەك یەك بن، بەڵام لە واتایی شێوازیدا جیاوازبن، چونکە زۆربەی وشەی هاو واتا تەنیا لە واتایی هۆشەکیدا هاوبەشن.

## ٤. پێناسەی هاو واتا

هەروەك و چۆن لەسەربوون و نەبوونی زمانەوانەکان رێك نەکەوتن ئاواش چەند پێناسەیەکی جیاواز هەیە کە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

لەلایەنی پەردۆزی هێما: بریتییە لە دوو دەربڕین کە لەگەڵ هەمان شت بەکاردەهێنرێت. لەلایەنی پەردۆزی تێڕوانین: بریتییە لە دوو دەربڕین کە هەمان پەری هۆشەکی یاخود وێنەی هەبێت. لەلایەنی پەردۆزی رەوشتی: بریتییە لە دوو دەربڕینی وەك یەك لە رێگایی گمیاندنی هەریەك لەدوو دەربڕینەکە کە هەمان کاریگەری و وەڵامدانەوەیان هەبێت. لەلایەنی پەردۆزی شیکردنەوە: بریتییە لە دوو دەربڕین کە هاوبەشن لە کۆمەڵێك سیفاتی سەرەکی [١٣].

عبدالحمید حسن دەڵێت: دوو وشەی تاك یان چەند وشەیەکی یەك واتایان هەبێت و شوێنێکی سەربەخۆی هەبێت بۆ گمیاندنی واتاکەی [١٤]. فخرالدین الرازی دەڵێت : بریتییە لە چەند وشەیەکی تاك کە یەك واتایان هەبێت و بەیەك شێوە. الشوکانی دەڵێت: وشە تاکەکان وەك یەك بن لەسەر یەك ناو نراو بە شێوەیەکی وا کە یەك واتایان هەبێت پێی دەڵێن هاوواتا [١٥]. نەورەحمانی حاجی مارف دەڵێت: هاوواتا بەو وشانە دەڵێن کەیەك مانا دەبەخشن و ماناکانیان لێك نزیکە، بەڵام لە خوێندنەوە و نووسیندا جیاوازن [١٦]. هاوواتایی بریتییە لەو پەیوەندییە واتاییەی کە دوو وشە یان زیاتر لە نزیکی واتا بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بەڵام ناگاتە رادەی وەك یەکی.

## ٥. سەرچاوەی دروستبوونی هاوواتا

ئاشکرایە کە زمان بەردەوام لە گەشە و گۆڕاندایە جا بە هۆی ئەم گەشە و گۆڕانە پێشکەوتنی ئەم زمانەش هاوواتاش بەردەسێنێت و گەشە دەکات. جا پەیدابوون و گەشەسەندنی دانەکانی زمانی کوردی وەکو هەموو زمانەکانی تر لە دوو رێگەوە سەری هەڵداوە:

أ- رێگەی راستەوخۆ: بە هۆی هەڵێنجانی وشەی کوردی رەسەنە لە ناو زارەکانی زمانی کوردیدا.

ب- رێگەی لاوەکی: ئەویش بە وەرگرتنی وشەی بێگانەوە [١٧].

سەرچاوەی دروستبوونی هاوواتا دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١. بوونی چەند دیالێکت و بەشە دیالێکت لە زمانێکدا وەك: (لووت/کەپوو، قژ/پرچ، باسك/قۆڵ).

٢. له ئەنجامی بەکارهێنانی دوو شێوازی جیاواز یان بەکارهێنانی زاراوەی جیاواز وەك: (جەناب/بۆ، خوێ/سۆدیۆمی کلۆرید) [١٨].

٣. بە هۆی خواستنی وشەی بێگانە کەلە پال وشە رەسەنەکە بەکاردەهێنرێت وەك: (مەردووم/ئینسان/مرۆڤ فەقیر/ هەژار) [١٩].

هەندێك وشە هاوواتان، بەلام تاکێکیان لە چەند فرێزێکدا بەو واتایە دێت وەك: (خۆی شاردەوە/خۆی مەلاس دا، کتێبەکەی شاردەوە / خۆی مەلاس دا) [٢٠].

٤. هۆکاری دەروونی زۆرجار دەبێتە هۆی دروستبوونی هاواتا وەك بۆ مردن چەند وشەو دەستەواژەیەك هەیە وەك چرای ژیانی کوژایەوە، شەمری خوای کرد، کۆچی دوایی کرد.......هتد [٢١].

## ٦. جۆرەکانی هاوواتا

١. هاوواتایی تەواو: کاتێك کە دوو وشە بە تەواوی وەك یەك بن هیچ خاوەن زمانێك هەست بە جیاوازیان نەکات و توانای جێ گۆرکێیان هەبێت لە بەکارهێنانا. هاواتایی تەواو لە زمانی کوردی و زمانانی تر بەرچاو ناکەوێت و ناشبێت، چونکە دوو وشە یان زیاتر هەرگیز ناتوانترێت لە شوێن یەکتر دابنێرێن و هەموو جۆرە واتا لاوەکییەکانیش دەبنە کۆت لەبەر دەم هاواتابوونی تەواو.

٢. هاوواتای ناتەواو: ئەوەیە کە دوو وشە زۆر لێك نزیك بن بە پلەیەك نەتوانرێت لێك جیابکرێنەوە تەنها تایبەتمەندییەکانی واتایی نەبێت، واتە واتا لاوەکییەکان، کە هەموو دوو وشە هاوواتاکان دەگرێتەوە، چونکە لە واتای لاوەکیدا جیاوازن. وەك: ناو: ناڤ.

٣. نزیکی واتا: ئەمەش کاتێك دەبێت کە دوو ماناەکەی لێك نزیکە و بە سەیرکردنێك لێك جیادەکرێنەوە وەك: ژن: ئافرەت.

٤. پێویستی: ئەمەش بابەتی رێکخستن دەگرێتەوە، واتە بە هۆی پێویستی هاوواتاوە دروست دەبێت.

٥. دەربڕینی وەك یەك: كاتێك دوو ڕستەیەك مانایان هەبێت لە زمانێكدا و زمانەوان (نیلسن) ئەم جۆرەی دابەش كردووە بۆ سێ جۆر.

أ- شوێن گۆڕین: ئەویش بە گۆڕینی شوێنی وشە لە ڕستەدا بەتایبەتی ئەو زمانانەی كە ئازادی و ڕێپێدانی گۆڕینی هەیە ئەویش بە دەرخستنی وشەیەكی دیاری كراو لە ڕستەدا بێ ئەوەی واتا گشتییەكەی بگۆڕێت. ئەمەش لە زماندا بەرچاوناكەوێت، چونكە وشە كە دەچێتە دووریەر بەشێك لە واتاكەی وندەكات و بەشێكیش كەم دەكات. وەك:

- رزگار ڕۆنیای خۆشدەوێت.
- ڕۆنیا رزگاری خۆشدەوێت.

ئەم دوو ڕستەیە هەرچەندە وەك هاوواتا دێنە بەرچاو، بەڵام جیاوازن لە واتای بابەتی، چونكە هەریەكە لە گۆشەنیگایەكەوە سەیركراوە.

ب- بەیەكداچوونی فەرهەنگی: واتا وشەكان لە فەرهەنگدا بەیەكداچوون وەك ئەوەی كە دەربڕینێك بە تاكە وشەیەكی تر دەربڕدرێت، بۆ نموونە: دایكی منداڵان: خێزان یان ژن

ج- لەجیاتی دانان: واتە بتوانرێت وشەیەك لە جێگایی وشەیەكی تر دابنرێت، كە هەمان واتای هەبێت. ئەمەش دەگمەنە لە زماندا. بۆ نموونە لەم ڕستەیە ناتوانین (خوار) لە شوێنی (لار) دابنێین:

لە ڕستەی:

- ئەم دارە خوارە. ناتوانین بڵێین: ئەم دارە لارە.

چونكە هاوڕێتی وشەی (دار) لەگەڵ (خوار) هەیە نەك (لار). بەمەش نائاسایی واتایی دێتەكایەوە.

٦. وەرگێران: ئەویش كاتێك دوو دەربڕین یان دوو ڕستە لە دوو زماندا یا لە یەك زماندا بەرامبەر بەیەك دەوەستن، وەك: فەقیر: هەژار.

ڕوونكردنەوە: تێگەیشتنی زمان لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر جیاوازی هەیە و دەگۆڕێت كاتێك شتێك ڕوون دەكرێتەوە ئەم ڕوونكردنەوەیەش لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر دەگۆڕێت [٢٢]. وەك: دوژمن: كەسی ناحەز.

## کورتە و ئەنجام:

١. هاوواتایی پەیوەندییەکی واتاییە و دوو وشە یان زیاتر لە نزیکی واتا بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بەڵام ناگاتە رادەی وەکیەکی.

٢. هاواتایی تەواو لە زمانی کوردی و زمانانی تر بەرچاو ناکەوێت و ناشبێت، چونکە دوو وشە یان زیاتر هەرگیز ناتواندرێت لە شوێن یەکتر دابنێرێن و هەموو جۆرە واتا لاوەکییەکانیش دەبنە کۆت لەبەر دەم هاواتابوونی تەواو.

٣. وشە کە دەچێتە رستەوە بەشێك لە واتاکەی ون دەکات و بەشێکیش واتا لە وشەکانی دەوروبەر وەردەگرێت، بۆیەش دوو وشەکە هەرگیز نابنە هاوواتای تەواو. بۆ نموونە

- ئەم دارە خوارە.
- ئەم دارە لارە.

لێرەدا (خوار و لار) نابنە هاوواتا هەرچەندە خۆشیان هاواتا تین لە سنووری وشەش چونکە واتای شێوازیان جیاوازە لەم دوو رستەیەش نابنە هاوواتا، بەڵکو نا ناسایی واتاشی دورستکردووە، چونکە بنەمای هاورێیەتی بەزانەدووە و( دار) هاورێیەتی و بەیەکەوە هاتنی لەگەڵ (خوار) هەیە نەك( لار).

## پەراوێزەکان:

١. (احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٢١).
٢. (سەرچاوەی پێشوو. ٢١٧).
٣. (سەرچاوەی پێشوو. ٢١٧).
٤. (سەرچاوەی پێشوو.١٩٨٢: ٢١٦).
٥. (جۆن لاینز: ١٩٦٨: ٧٦).
٦. (احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٢١٧).
٧. (سەرچاوەی پێشوو.١٩٨٢: ٢٢٧).
٨. (سەرچاوەی پێشوو.١٩٨٢: ٢١٨).
٩. (سەرچاوەی پێشوو.١٩٨٢: ٢١٨).
١٠. (بیخاڵ عبدالله سعید: ١٩٨٢: ٧٧).
١١. (احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٢١٧).
١٢. (جون لاینز: ١٩٦٨: ٧٦).
١٣. (احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٢١٥).
١٤. (عبدالحمید حسن: ١٩٧١: ٧٢).
١٥. (علي زوين:١٩٨٦: ١٣٤).
١٦. ( نەورەحمانی حاجی مارف: ١٩٧٥: ٢٠).
١٧. (سەرچاوەی پێشوو.١٩٧٥: ٢٦).
١٨. (محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٧٦).
١٩. ( نەورەحمانی حاجی مارف: ١٩٧٥: ١٧٦).
٢٠. (محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ١٧٦).
٢١. (عبدالحمید حسن : ١٩٧١: ٧٢).
٢٢. ( احمد مختار عمر: ١٩٨٢: ٢٢/٢٢٣).

## سەرەتا:

ئاشكرایە كە زمان بەردی بناغەی كۆمەڵە و زمانیش تاكە ڕێگەیە بۆ پاراستنی كەلتوور و زانیاری و گواستنەوەی لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی تر ڕێزگرتنیش دیاردەیەكی بەرچاوە لە كەلتوور و كۆمەڵگای كوردەواریدا و لە ڕێگای زمانەوە دەردەبڕدرێت.

ئەم باسە تیشك دەخاتە دەستنیشانكردن و شیكردنەوەی هەندێ وشە و ڕستە و دەستەواژە، كە بۆ ڕێزگرتنی بەرامبەر لە كۆمەڵگای كوردەواریدا بەكاردێت لە دیدی پراگماتیكەوە و بە پێی ڕێبازی ئەركی شیكاری.

## تەوەرەی یەكەم:

### ١. (زمان و ئەتنۆگرافیا):

ئەتنۆگرافیا زانستی داب و نەریتی میللەتانە و پەیوەندییەكی بەتینی بە زمانەوانییەوە هەیە ئەم پەیوەندییەش دوو لایەن دەگرێتەوە:

١. زمان ڕێگا بۆ ئەتنۆگرافیا خۆش دەكا كە بڕوانێتە پێوەندی مێژوویی و كەلتووری نێو میللەتان، چونكە زمان گرنگترین نیشانەی ڕەگەز و نەژادە.

٢. ئەتنۆگرافیا لە دابەشكردنی زمان و میللەتان و لێكدانەوەی هەستی نەتەوایەتیشدا بەرچاو دەكەوێ[1].

ئەم پەیوەندییەش (زمانەوانی ئەنترۆپۆلۆجی) لێكەوتەوە كە لە پەیوەندی نێوان زمان و كەلتوور دەكۆڵێتەوە و لە سەدەی بیستەم پێشكەوتنەكی تەواوی بەخۆوە بینی و زۆر لە زمانەوانەكانی وەك: بواز، ۆرف، هایز، كرۆبێر، هۆل، تراگر....جەختیان لەسەر گرنگی كەلتوور كردەوە لە زمان.

گرنگیدان بە كەلتوور لە زمان كاتێك دەركەوت كە وەك پێویستییەكی گرنگ خۆی نیشاندا لە لێكدانەوەی هەندێ وشە و ڕستە، كە بە تەنها بە لەبەر چاوگرتنی كەلتوور لێكدەدرایەوە.كێشەكەش بەزەقی لەوەرگێڕاندا دەركەوت (٢). بۆ نموونە لە دەقێكی هیندی ئەگەر وشەیەكی وەك (مانگا) وەربگێڕینە سەر زمانی كوردی ئەوا ئەو پیرۆزییەی نامێنێ كە لە كەلتووری هیندیدا هەیەتی.ثثثثث

## ٢. زمان وەك دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی:

زمان پێویستییەكی كۆمەڵە بۆ لەیەكتر گەیشتن و گۆڕینەوەی بیروڕا و گواستنەوەی كەلتوور.........هتد، زۆر لە زمانەوانەكانی وەك: (فندریس و مار و سۆسێر،........هتد) جەختیان لەسەر ئەم ڕاستییە كرد هەربۆیەش پێناسەی زمان بەوە دەكەن كە: (زمان چالاكییەكی كۆمەڵایەتییە)، چونكە هۆیەكە بۆ بەیەك گەیاندنی نێوان كەسەكان[٣].

خاسیەتی بایلۆجی مرۆڤ دەتوانێ دوور لە كۆمەڵگا ئەش و نما بكا، بەڵام زمان بێ كۆمەڵگا ناتوانێ گەشە بكا، بۆ نموونە: ئەگەر منداڵێكی زۆلووس لە چین دابنێین و منداڵێكی چینیش لە ئەفریقیا لای زۆلووسەكان دابنێین، دەبینین منداڵە زۆلووسەكە بە زمانی چینی قسە دەكا و منداڵە چینییەكەش بە زۆلووسی قسە دەكا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، كە زمان میراتێكی بەدەنی نییە(٤)، بەڵكو زمان دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە، چونكە:

١. مرۆڤ بە هۆی زمانەوە دەتوانێ لە ناو كۆمەڵ بژی و بێنێتەوە و لە زۆر باردا زمان بۆ گەیاندنی زانیاری و هەواڵ بەكار نایەت، بەڵكو بۆ زۆر ئەركی كۆمەڵایەتی، وەك: خۆبردنە پێش و خۆچەسپاندن و شوێن گرتن لە ناو كۆمەڵ بەكاردێت، بۆ نموونە: (سڵاو و چاكی و چۆنی و رۆژباش....هتد) لە ژیانی رۆژانەی مرۆڤ بە مەبەستی رازیكردنی خەڵك بەكاردێت.
٢. زمان ناسنامەی كۆمەڵایەتی قسەكەر دەردەخات و لە ڕێگای زمانەوە دەتوانین بڕیار بدەین قسەكەر خەڵكی كێیە و لە چ بارێكی دەروونیدا دەژی و هەستی بەرامبەر بابەتی قسەكە و گوێگر و دەوروبەری چییە و سەر بە چ چینێكە و رادەی خوێندەواری چەندە.
٣. زمان مرۆڤ و دەوروبەری بەیەكەوە گرێدەدا و لە هەمانكاتیشدا ڕەنگدانەوەی ئەو بارە كۆمەڵایەتییە كە قسەكەران تێیدا دەژین. بەڵگەشمان ئەو وشەو زاراوانەیە كە بێ بەستنەوەیان بە باری كۆمەڵایەتی خەڵك لێكنادرێنەوە، بۆ نموونە چەندین وشەی وەك: (مسكێن و ڕەنجدەر و مەیتەر.........هتد) پێرەوێكی كۆمەڵایەتی پێكدێنن و لە دەرەوەی ئەو پێرەوە واتایان لێكنادرێتەوە[٥].

## ٣. کاریگەری کۆمەڵ لەسەر تاك

زمان پەیوەندییەکی بەتینی بە کۆمەڵەوە هەیە و زۆریش لە زمانەوانەکانی وەك: (*مالینۆفسکی، فنیپ، پایك، سۆسێر.... هتد*) زمان وەك دیاردەیەکی کۆمەڵ سەیردەکەن. تاك و دەوروبەر کارلێکدەکەن و هەریەکەیان کاریگەری لەسەر ئەوی تر هەیە، هەموو تاکێك دەکەوێتە بەر یاسا کۆمەڵایەتییەکان و بەرادەیەك سەربەست نییە لە تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆی لێرەشدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تاك دوو تەوەرە وەردەگرێت:

### ١. پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی سەرەتایی:

ئەم پەیوەندییە خێزان دەگرێتەوە وەك کۆمەڵگایەکی بچووك و لە ئەنجامی کارلێکردنی لەگەڵ دایك و باوکدا پەیدا دەبێت ئەم کۆمەڵگایە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر تاك هەیە بۆ ئاراستەکردنی رەوشت و داب و نەریتی بەمەش تاك واز لە زۆر پێداویستی زەوقی خۆی دێنێت بۆ رازیکردنی دایك و باوك و کەسانی لە خۆگەورەتر و زۆر شت لە خێزان وەردەگرێت وەك ئادابی دانیشتن و خواردن و لێبووردەیی و رێزگرتنی گەورە و بیروباوەڕ و ئاین.....هتد.

### ٢. پەیوەندیی بە کۆمەڵ:

ئەم پەیوەندییەی تاکە لە تەمەنی[٦] ساڵی بەرە و سەرەوە دەستپێدەکات کاتێك تاك لە بازنەی خێزان دەچێتە دەرێ و پەیوەندی لەگەڵ چەند کەسانێکی تر پەیدا دەکات و هەوڵ دەدات پەیوەندی بەهێز بکات و ئەگەر هاوڕێیانیشی لێی دوورە پەرێز بوون ئەوا هەوڵدەدات یان خۆیان لەگەڵ بگونجێنی یان لەگەڵ کۆمەڵێکی تری لە خۆی نزیك بازنەیەك دورست بکات لەوێش هەندێ رەوشت وەردەگرێت و ئەگەر ئەچێتە قوتابخانەش ئەوا لە شوێنی کارکردنی تێکەڵی چەند کەسانێك دەبێت و هەوڵی خۆگونجاندن دەدات، چونکە دەزانێ سەرکەوتنی لە هاریکاریکردن و رازیبوونی خاوەن کارەکە دایە[٧].

### ٤. شێوازی زمانی قسەکردن

مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەیدا بە چەندین شێوە خۆی دەبینێتەوە و بەچەندین شێواز قسە دەکات هەوڵدەدات هاریکاری ئاخاوتنی نێوان خۆی و گوێگرەکەی نەپچڕێ هەر بۆیەش کۆزمانەوانەکان زمان بەوە پێناسە دەکەن کە (زمان کۆمەڵە شێوازێکی جیایە هەریەکەیان بۆ بارێکی تایبەتی دەستدەدات) [٨].

شێواز لە ڕەخنەی ئەدەبیدا بەو بەرگە رازاوەیە دەگوترێت کە بە بیردا دەکرێت و لە زمانیشدا شێواز بریتییە لە هەڵبژاردن لە نێوان چەند دەربڕینێکی هاوشاندا[٩] مەبەستمان لە ڕێزگرتنی شێوازی قسەکردن تەنها لە باری پەیوەندی ئاسایی قسەکەر و گوێگرە، چونکە ئاشکرایە باری نائاسایی قسەکردن وەک: کاتی شەر و تووڕەبوون و عاجزی ڕێز کەم دەبێتەوە.

لێرەشدا دوو جۆرە شێواز سەر هەڵدەدات:

١. شێوازی ئاسایی:

که لە نێوان هاوەڵ و خزم و کەس و کار بەکاردەهێندرێت، وەک:

Peter ) ) کە ناوێکی رووتە.

٢. شێوازی رەسمی:

کە لە بۆنەی گرنگدا و لە نێوان ئەو کەسانە بەکاردەهێندرێت کە ناسیاوییەکی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەیە و ڕێزێکی زۆری تێدایە وەک: 9)( ( Mr. Hill)

## تەوەرەی دووەم:

### ١- رێز لە کەلتووری کوردەواریدا

کورد بە یەکێک لە نەتەوە کۆنەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست دەژمێردرێت خاوەنی شارستانییەت بووە و پاشماوە بەجێماوەکانی ئەشکەوتی شانەدەر و هەزارمێرد و گوندی جەرمۆ شایەتی ئەوە دەدەن، کە کورد حەزی لە بەیەکەوە ژیان و ژیانی کۆمەڵگا بووە[١٠] یاساکانی کۆمەڵگاش سەرپەرشتی دابونەریت و سۆزی کردووە هەروەك (ڤندریس) دەڵێت: (کۆمەڵگا سەرپەرشتی رەوشتی کەس دەکات و لە قالبێکدا دایدەرێژێت و هەر کەسێکیش لێی لابدات روبەرووی سزای کۆمەڵگا دەبێتەوە کە سووکترینیان گاڵتە پێکردنە)[١١].

ژیان و رەوشتی مرۆڤ ئاوێتەی تۆرێکی هەستییە بەرامبەر بە خودی خۆی و کەسانی ترو و شت [١٢] و بەرای (بالی)یش هەرکردەیەکی گوتنیش هەڵگری کاریگەرییەکی دەروونییە[١٣] رێزگرتن دیاردەیەکی هەست دەربڕینە بە باشی بەرامبەر بە کەسانێك کە بە پێی کەلتوور لە گۆراندایە و بۆ ئەم مەبەستەش جیاوازییەکی زۆر لە رێزگرتن لە کەلتووری رۆژهەڵات و رۆژئاواییەکاندا هەیە، بۆ نموونە: لە خێزانی عەرەبیدا قسەکردنی نێوان کوڕ و باوك رێزگرتنی تیادایە کەچی لە خێزانێکی ئینگلیزیدا شێوازێکی ئاسایی بەکاردەهێندرێ و بەرامبەر بێگانەش ئینگلیزەکان رێزێکی زۆر هەیە هەر بۆیەش دەبینین ئینگلیزەکان بەناوی یەکەم بانگی بێگانە ناکەن، بەڵکو تەنها لە نێوان خزم و کەس وکار و هاوەڵ بەکاردەهێندرێت و بێگانە بە نازناوەکەی بانگ دەکرێت و بانگکردن بە ناوی رووتی خۆی لە کەلتووری ئەوان بێرێزی دەگەیەنێت، و لە خێزانی کوردیشدا بە شێوازێکی ئاسایی کوڕ لەگەڵ باوکی قسە دەکات لەگەڵ بێگانەش بەرێزەوە قسە دەکات و بە ناوی خۆیەوە بانگی ناکات، بەڵکو وشەی (کاك) دەخاتە پێش ناوەکە، بانگکردنیش بە پێی تەمەن و رادەی ناسیاوی و پلە و پایە و ....هتد دەگۆردرێت[١٤]، لە کەلتووری کوردەواریش بەچەند

شێوە دێتە بەرچاو کە هەندێکیان نازماتینین وەك مەر لەبەر پێ سەربڕینی مێوان یان هەستانەوە لەبەر کەس و دانان لە ڕیزی پێشەوە و بە پێشخستن و شوێن پێدان بە نافرەت لە لەناو پاس ......هتد ئەم ڕێزەش یان لە بێهێزی دایە یان لە نەزاکەت دایە، بەلآم ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوە هەبێت ئەو ڕێزگرتنەیە کە لە ڕێگای زمانەوە ئەنجام دەدرێت، لە ڕێگای هەندێ وشە و دەستەواژە و ڕستە وەك:

- بەرزکردنەوەی بەرامبەر و نزمکردنەوەی خۆت وەك:

(بەرێز، جەناب، کاك، گەورەم، قوربان، بەندەت، خزمەتکارت......... دڵم کرایەوە، ماڵەکەت روناك کردەوە، بەغولامت دەبم......)

- نزمکردنەوەی شت وەك:

(ئەم خواردنە شایەنی تۆ نییە، ئەم ئیشە بە کاری تۆ ناشێت،.....هتد)[15]
ڕێزگرتن لە کەلتووری کوردەواریدا بە دوو شێوە دێتە بەرچاو:

**A. بەرێگای ڕاستەوخۆ:**

بەکارهێنانی نازناو دەگرێتەوە کە جۆرە ترخێك دەداتە کەسەکە و بە چەند شێوەیەك دێتە بەرچاو وەك:

أ- کۆمەلآیەتی وەك سەید، شێخ، ئاغا، بەگ، میر.......هتد.

ب- خزمایەتی وەك: کاك، مام، خاڵ، خوشك،.........هتد

ت- پیشە وەك: دکتۆر، وەستا، مامۆستا،............هتد

هەندێ جاریش لە ڕێگەی دەستەواژە و ڕستەدا دەبێت وەك:

✓ من ڕێزت لێدەگرم

**B. بە ڕێگای ناڕاستەوخۆ:** کە لێکدانەوەی دەبێت لە دیدی پراگماتیکەوە بێت و لەم ڕوانگانەی خوارەوە:

## ٢- رێزگرتن لە دیدی پراگماتیکدا:

### ١. رێزگرتن لە دیدی کردە قسەییەکانەوە:

کردەی قسەیی تیۆریکە هەموو قسەیەك بە ئەنجامدانی کارێك دادەنێت (ئۆستن) لەو باوەڕەدایە زمان کردەیە [١٦] ئەگەر لە هەر گوتنێك ورد ببینەوە ئەوا چەندین کردە لەخۆدەگرێ وەك: ( راگەیاندن و پرسیارکردن و داخوازی، بەڵێندان، سەرزەنشت و گلەیی و ...هتد) [١٧] ( کریستەل) لەو باوەڕەدایە ئەم تیۆرە رۆڵی ناخاوتن شیدەکاتەوە لە دەربڕینی پەیوەندی رەوشتی (قسەکەر و گوێگر) لە ناخاوتندا [١٨] بە دوو شێوە ئەنجام دەدرێت [١٩]:

- راستەوخۆ وەك:
  - ➢ رێزت هەیە، چاوماتی.
- ناراستەوخۆ وەك :
  - ➢ دەرمانەکانت ناخۆی؟

لە راستدا ئەم رستەیە پرسیار نییە داخوازییە، واتە (دەرمانەکانت بخۆ)، بەڵام بە شێوەی پرسیار وەك ( بیرهێنانەوە) یەك دەربراوە بۆ نیشاندانی رێز.

- ➢ دەستت دەگاتە قەڵەمەکە؟

ئەم رستەیەش داخوازییە، واتە (قەڵەمەکەم بدێ)، بەڵام بە شێوەی پرسیار دەربراوە بۆ نیشاندانی رێز.

- ➢ منداڵەکان خەویان دێت.

ئەم رستەیە داخوازیی و فەرماندانە، واتە (هەستە بابڕۆین ) ئەگەر لە ژنێك بێت بۆ مێردەکەی، بەڵام بۆ رێزگرتن بە شێوەی هەواڵدان دەربراوە.

- ➢ چایەکەت سارد بۆوە.

ئەم رستەیەش فەرماندانە، واتە (چایەکەت بخۆوە)، بەڵام بە شێوەی هەواڵدان دەربراوە بۆ دەربڕینی رێز، چونکە بێزێنییە (ئەمر) لەسەر کەسێکی وەك مێوان بکرێت.

(هێز)یش ڕۆڵی خۆی هەیە بۆ ڕێزگرتنی بەرامبەر، بۆ نموونە هەر رستەیەك هێزەکە لە سەرەتا بێت ئەگەر داواش بێت ئەوا دەبێتە (ئەمر) کە ڕێزی تێدا نییە وەك:

➢ ئەو کتێبەم بۆ بێنە.

## ٢. ڕێزگرتن لە ڕێی نیشانکارەکانەوە:

نیشانکارەکان زمان و دەوروبەر بەیەکەوە گرێدەدەن و لە سنووری بۆچوونی ئاماژە کاردەکات و ئاماژەنە بۆ کەس و کات و شوێن و پلە و پایەی کۆمەڵایەتی و ناستیان نیشان دەدات [٢٠] و ئەوەی پەیوەندی بە ڕێزگرتنەوە هەبێت نیشانە کۆمەڵایەتییەکانە کە شێوازێکی لێکسیکی یان ڕێزمانی دیارە کە بە شێوەیەکی باو بەکاردێت بۆ دەربڕینی ڕێز بەرامبەر بە گوێگر [٢١] وەك: (کاکە، خاڵە، مامە، خوشکە، پورێ، دکتۆر، وەستا..... هتد) وەك:

➢ کاك دیدار وەرە.

➢ خوشکە شیلان چیدەکەی؟

➢ دکتۆر نەخۆشەکەمان چۆنە؟

➢ وەستا کەی کارەکەمان تەواو دەبێ.

بەکارهێنانی ئەم نیشانکارانە لە پەیوەندیکردن نرخ و ڕێز دەدات بەکار نەهێنانی بێڕێزی تیایە بەرمبەر بە کەسی بەرامبەر.

هەندێ جاریش نیشانە کەسییەکان کە (ڕاناو)ەکان دەگرێتەوە وەکو ڕێز بەکار دەهێندرێ کاتێك تاك بەرامبەرەکەی تاك بێت، بەڵام بە کۆ قسەی لەگەڵ بکات وەك:

➢ فەرموون.

یان خۆی تاك بێت، بەڵام بە کۆ قسە بکات[٢٢] وەك:

➢ ئێمە قسەی لێدەکەین باشە؟

➢

### ٢. ڕێزگرتن لە ڕیسی دەرکەوتەکان:

بریتییە لە لێکدانەوەو شیکردنەوەی ناخاوتن. بە تایبەتی ئەو زانیاریانەی کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرنەبڕاوە، *(گرایس)* لە ساڵی (١٩٧٥)دا دەریخستووە، کە ناخاوتن لەسەر بنەمایەکی هاریکاری نێوان (نێنەر)و (وەرگر) بەڕێوەدەچێت[٢٣] و بە دوو شێوە بەرچاو دەکەوێت:

**أ- پیادەکردنی بنەماکانی هاریکاری:**

واتە پەیڕەوکردنی ئەم بنەمایانەی خوارەوە کە نەخشە کێشانێکە بۆ ئەوەی ناخاوتن شێوەی نموونەیی وەربگرێ کە ئەمانەن:

١- چەندیتی: بەشداریکردنەکەت بە پێی پێویست بێت، واتە نە زۆر و نەکەم:

٢- چۆنیتی: دەبێ بەشداریەکەت ڕاست بێت.

٣- پەیوەندی: دەبێ بەشداریەکەت گونجاو بێت.

٤- شێواز: واتە بەشداریکردنەکەت ڕوون و ئاشکرا بێت. ئاشکرابێت.

**ب- لادان لە بنەماکانی هاریکاری:**

ئەوەی پەیوەندی بە ڕێزگرتنەوە هەبێت لادانە لە چۆنییەتی کە لە ڕێگای خواستنەوە بەدی دەکرێت خواستنیش لادانە لە یاسای زمان[٢٤] و دوو جۆرە:

A. خواستنی ڕوونکردنەوە.

B. خواستنی ویژدانی.

ئەوەی پەیوەندی بە ڕێزگرتنەوە هەبێت (خواستنی ویژدانی)یە، کە هەست و سۆز دەردەبڕێت بەرامبەر بە کەسێك وەك:

- ژن کوڵکەی ماڵە[٢٥]

ئەمە ڕێزێکە لە ئافرەت، چونکە بە کوڵکەی ماڵی چواندووە ئاشکراش کوڵکە بنچینەی خانووە.

. یان چەند ڕستەیەکی وەك:

- ماڵەکەت ڕوناك کردەوە.
- چاوم ڕوون بووەوە.
- گەورەت کردین.
- دڵم کرایەوە.

## ٤. ڕێزگرتن لە دیدی ڕۆشنبیری ئافرەتەوە

قسەیەکە لە نێوان دوو کەس یا زیاتر کە بە ئازادی بەڕێوەدەچێ و دابەشی سەرە ناوەڕاست و کۆتایی دەبێت و لەسەردوو بنەمابەندە[٢٦].

### ١- نۆبەگرتن

بریتییە نۆبەگرتنی قسەلە نێوان دوو کەس یان زیاتر کە بە پێی کەلتوور لە گۆڕاندایە قسەکردن لە(قسەکەر)ەوە بۆ (قسەکەر)ێکی دەگۆڕێت. قسەکەری یەکەم دەدوێ و رادەوستێ یەکێکی تر قسە دەکات و بەردەوام دەبێت و دەوەستێ. جا بۆ ڕێزگرتنی بەرامبەر دەبێت لەسەر خۆ و بە ئاوازەیەکی نزم قسەبکرێت، چونکە ئەگەر قسەیەك بە تووندوتیژی بکرێ ئەوا ڕێزی تێدا نییە.

قسە پێ نەبڕینیش ڕێزلێنانە بۆ بەرامبەرەکەی، بۆ نموونە کاتێك یەکێك قسە بە بەرامبەرەکەی ببڕێت و بواری نەدات لە نۆبەی خۆی قسە بکات ئەوا پێی دەڵێت:

- قسەت بشەکر بێت.
- قسەت بشەکر دەبڕم.

### ٢- جووتەگوتن

بریتییە لە دوو گوتن کە هەریەکەیان لەلایەن (قسەکەر)ێکەوە دەگوترێ لەم بنەمایەدا جووتە گوتنەکان هەندێکیان هەڵگری ڕێزن وەك:

أ- جووتە گوتنەکانی نرخاندن:

لەم جووتە گوتنانە (قسەکەران) نرخاندنی خۆیان بەرامبەر بەکەس و شت و ڕووداو دەردەبڕن. وەك:

أ-کوڕەکەت دەستپاك و ڕاستگۆیە.

ب- سوپاس بە خاڵی دەچی.

ب- جووتە گوتنەکانی پەوزشبایی:

ئەم جووتە گوتنانە لە پەوزشبایدا بەکاردێت کە(قسەکەر) ڕێزێکی باش بەرامبەر بەکەسەکە دەردەبڕێ.

وەك: أ- سەیارەکەت پیرۆزە.

ب- سوپاست دەکەم.

ت- جووتە گوتنەکانی پەژارە دەربڕین:

ئەم جووتە گوتنانە (قسەکەر) پەژارەی خۆی بەرامبەر بە کارەساتێك یان رووداوێك دەردەبڕێ بۆ رێزی بەرامبەر وەك:

أ- بەخۆتان خۆشبێ.

ب- سوپاست دەکەم.

**ئەنجام**

١. رێزگرتن دیاردەیەکی هەست دەربڕینە بە باشی بەرامبەر بە کەسانێك کە بە پێی کەلتوور لە گۆڕاندایە.

٢. کۆمەڵ پەیوەندی تاك بە کەسانی تر دیار دەکات و تاکیش لە دوو کۆمەڵگادا گەورە دەبێت (خێزان و کۆمەڵ) هەردووکیشیان کاریگەرییان بەسەر هەڵسوکەوت و رەوشتی تاکەوە هەیە، رێزگرتنیش لەوانەوە وەردەگرێت.

٣. کۆمەڵگای کوردەواری رێز لە کەسانی دوورو نزیك دەگرێت.

٤. رێزگرتن دیاردەیەکی باو و بەرچاوە لە کەلتووری کوردیدا و پشتاو پشت ماوەتەوە بەر چاو دەکەوێت لە پەندی پێشینان و قسەی رۆژانەی خەڵك کە زادەی هەست و سۆزی ناسکی کوردە بەرامبەر بە کەسانی نزیك و دوور ئەمەش پتەوی پەیوەندی کۆمەڵگای کوردەواریش دەردەخات.

٥. مرۆڤ لە ژیانی رۆژانەیدا بە چەندین شێوە خۆی دەبینێتەوە و بە چەندین شێواز قسە دەکات هەوڵدەدات هاریکاری ئاخاوتنی نێوان خۆی و گوێگرەکەی تەپچڕێ.

٦. رێزگرتن بە دوو شێوە دێتەبەرچاو (راستەوخۆ و ناراستەوخۆ) و ناراستەوخۆ کە لە دیدی پراگماتیکەوە لێکدەدرێتەوە و لە چوار روانگەوە کە بریتین لە(کردەقسەیەکان-نیشانکارەکان-دەرکەوتەکان-رۆنانی ئاخاوتن).

## پەراوێزەکان:


١. میـیا: ١٩٩٨: ١٧.

٢. میلکا افیتش: ١٩٩٦: ٢٩٧.

٣. حاتم صالح الضامن:١٩٨٩: ٣٦.

٤. نەورەحمانی حاجی مارف (١٩٨٦): ٢٨.

٥. محمد معروف فتاح: ١٩٨٦: ١١٤.

٦. مصطفی فهمی:(-) : ١٦٧-١٦٩.

٧. محمد معروف فتاح: ١٩٩٠: ٥.

٨. محمد معروف فتاح: ١٩٨٥: ٢٢٣.

٩. یونیل یوسف عزیز و حی تر: ١٩٨٤: ١٠٠.

١٠. جمال رشید & فوزی رشید: ١٩٩٠: ١٨.

١١. رمضان عبدالتواب: ١٩٨٢: ١٢٧.

١٢. م.م لویس: ١٩٥٩: ١١٣.

١٣. میلکا افیتش: ١٩٩٦: ٢٤٣.

١٤. یونیل یوسف عزیز و حی تر: ١٩٨٤: ١٠١.

١٥. Levinson: 1997: 63.

١٦. L Ausitin: 1972: 13.

١٧. Aitchison: 1987: 99.

١٨. D. crystal: 1991: 323.

١٩. Finch: 1998: 168.

٢٠. Formkin&Roman: 1983: 190.

٢١. . Levinson: 1997: 63

٢٢. Trask, R, L.1998: 129.

٢٣. عادل فاخوری: ١٩٨٩: ١٤٦.

٢٤. جان کوهین: ١٩٨٦: ٦٦.

٢٥. داود عبده: ١٩٨٤: ١٣.

٢٦. Levinson: 1997: 297-301

**سەرەتا:**

لادانی واتایی تایبەتمەندییەکی زمانی شیعرە، هەستی مرۆڤی پێ دەوروژێنێ، بەوەش دەسکاریی ئەو پەیوەندییە دەکا، کە لە نێوان ناو و ناولێنراو دا هەیە، گۆڕان لە واتاکاندا دەکا بە مەبەستی رازاندنەوە، واتە وشەکان بۆ ئەو مەبەستە بەکار ناهێنن، کە لە کۆمەڵدا باوە و ئاسایییە، ئینجا ئەو گۆڕانە واتاییە بە بەزاندنی بنەمای هاریکاری دەبێت، کە ئاخاوتن بەڕێوەدەبات. مەبەست (لادانی واتایی لە زمانی شیعردا ) لادانی گۆڕانە لەو بەکارهێنانە باو و سواوەی زمان، کە رۆژانە بە سەر زاری خەڵکەوەن، بەمەش لادانی واتایی بریتی دەبێ لە باری نائاسایی بەکارهێنانی واتا. ئەو جیهانە تایبەتییەی شیعر هەیەتی، لەسەر بناغەی لادانی واتایی دروست دەبێت، بۆیە زمانی شیعر کێڵگەیەکی بە پیتی ئەم جۆرە لادانەیە. باسەکە تەنها باس لە بەزاندنی بنەماکانی هاریکاری دەکات و لادانە واتاییەکان دەستنیشان دەکات. باس لە لادانەکانی تری زمانی شیعر ناکات.

باسەکە لە ژێر رۆشنایی رێبازی ئەرکی و بۆچوونەکەی (گرایس)، زمانی شیعر شیدەکاتەوە.

باسەکە لە پێشەکی و دوو بەش و ئەنجام پێکهاتووە، بەشی یەکەم، ئەم سەردێڕانە دەگرێتەخۆی: (زمان و داهێنان، زمانی شیعر، واتای فەرهەنگی و واتای مەبەست، توانست و چالاکی لە زماندا، بنەماکانی هاریکاری لای گرایس).

بەشی دووەمیش ئەم سەردێڕانە دەگرێتە خۆی: (لادانی واتایی لە زمانی شیعر، لادان لە بنەماکانی هاریکاری، لادان لە چەندێتی، لادان لە چۆنیەتی، لادان لە گونجان، لادان لە شێواز. لە کۆتاییشدا ئەنجامەکان پێشکەشکراوە لەگەڵ کورتەیەک بە زمانی عەرەبی.

## تەوەرەی یەکەم: زمانی شیعر

### ١. زمان و داهێنان

زمان رێگەی ئەوە دەدات، کە تاك لە واقع هەڵبێت و هەست و ئارەزوو و هەڵچوونی خۆی لە قاڵبێکدا دابرێژێت، زمانێکی تایبەت بە خۆی دروست بکات، لە یاساو رێساکانی زمان لابدات، کە باشتر وایە، بە داهێنان ناوی ببەین، چونکە یاساکانی زمانی ئاسایی دەبنە کۆت لە رێی داهێنانی شاعیر.

داهێنان بەرهەمی ئارەزووی مرۆڤە بۆ دەرخستنی خود[1]. داهێنان لە زماندا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەڤدەم، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی تیۆری بەرهەمهێنان و گواستنەوەی (چۆمسکی) جارێکی تر جەخت لەسەر داهێنانی زمان کرایەوە، کە دەڵێت: (لە توانای قسەکەر دایە ژمارەیەکی بێ سنوور لە رستە بەرهەمم بێنێ و تێی بگات، بێ ئەوەی گوێی لێ بوویێت.) داهێنان تایبەتییەکی گرنگی زمانە و زۆر لە زمانەوانانی وەك: برجسۆن، کرۆتشە، فۆسلێر........ بانگێشەی ئەویان دەکرد، کە زمان داهێنانە، بۆ نموونە:

(هۆگۆشۆخارت) دەڵێت: (زمان داهێنانێکی تاکە کەسییە، کۆمەڵ لە رێگای لاسایی کردنەوە دەیگشتێنێ، پێکهاتەی دەروونی تاکە کەس بنەمایەکی کاریگەرە لە داهێنان).

(ثوراندایك) دەڵێت: ( زمان گەورەترین داهێنانی تاکە)[2].

زمان داهێنانە، چونکە:

- بەکارهێنانی زمان بەکارهێنانێکی نوێکردنەوەیە. بە واتایەکی تر ئەو قسەیەی مرۆڤ دەیکات، بەزۆری بەکارهێنانێکی لە خۆوەیە، هەندێ دەستەواژەی لێدەرچێت، ئەگەر نا قسەکان دووبارە نین.
- زمان ناکەوێتە بەر هیچ کۆتێکی دەرەکی و ناوەکی، بەڵکو ئازادە لە کۆت، هەر بۆیە زمان ئامێری دەربڕینی بیر و هۆشی تاکە.

• بەکارهێنانی پتەوی زمان و گونجانی لەگەڵ بارودۆخی قسەکردن. پتەوی زمان تایبەتییەکی سەرەکی زمانی مرۆڤە، کە هیچ شیکردنەوەیەکی نامێزی ناتوانێت، پتەویەکەی شیبکاتەوە[3]. داهێنان لە ئەدەب و هونەردا ڕێگایەکە بۆ پاککردنەوەی خود لەم بارەیەوە (گراهام گرین) دەڵێت: (نووسین شێوازێکی چارەسەرەو من دەپرسم ئەو کەسەی بۆی ڕێکناکەوێ بنووسێ یان مۆسیقایەك دابنێ یان وێنەیەك بکێشێ چۆن شێت نابێت ؟!)[4].

ئەگەر شاعیر بە داهێنەر دابنرێ، دەبێ جیهانێکی تایبەتی هەبێ و جۆرە سەربەستییەکی هەبێ، تا کارە هونەرییەکەی دروست بێ[5]، چونکە زمانی ئاسایی ناتوانێ، هەموو جۆرە دەربڕینێکی ناوەوە دەر بخات. ئەویش لە ڕێگای دەربڕینی کەم بەکارهاتوو و نامۆ، کەواتە، زمانی شیعر زمانێکی دروستکراوە [6] و داهێنانە.

## ٢. زمانی شیعر

شاعیران مامەڵەیەکی تایبەت لەگەڵ وشە دەکەن و بە شێوەیەکی ئاسایی بەکاری ناهێنن، بەڵکو بە جۆرێك بەکاری دێنن، کە جۆرە نەفسوونێك ببەخشن. شاعیر جۆرە ئازادییەکی هەیە هەر وەك دەڵێن: ئەوەی بۆ شاعیر ڕێپێدراوە بۆ کەسێکی تر ڕێپێنەدراوە.

(رۆبەرت فراس) لە پێناسەی شیعردا دەڵێت: شیعر ئەوەیە، کە شتێ بڵێی و مەبەستت شتێکی تر بێت، ئەمە بە هەموو واتایەکەوە کرۆکی شیعرە[7].

(ریتشارد) دەڵێت: شیعر شێوەی هەرەبەرزی زمانی سۆزە [8].

(رسکن) دەڵێت: شیعر دەرخستنی سۆزە لە ڕێگای ئەندێشە واتە، زمانی خوازەیە[9]. (موکارۆڤسکی): زمانی شیعر خاوەنی ئەویەری تایبەتمەندی زەقکردنەوەیە، واتە، لادانە لە پێوەری باو و ئاسایەکانی زمان [10].

زمانی شیعر لە رووی هەست و سۆزەوە دەوڵەمەندە و ویژدانی مرۆڤ دەناخێوی و وشە و رستەی بارگاویکراو بە هەست و سۆز هەڵدەبژێرێ بە مەبەستی کاریگەری

کردنە سەر بەرامبەر و دروستکردنی وەڵامێکی ویژدانی لای خوێنەر. ئەمەش ناپەتەدی ئەگەر پەیامەکە جێگای گرنگی خوێنەر نەبێت و پڕ نەبێت لە هەندێ خۆشی و ناخۆشی.

وشە سەرچاوەی پێکهێنەری زمانی شیعرە و ئامرازی دەستی شاعیرە و جگە لەمەش (دێل کافی)[11]، ئاماژە بۆ رۆڵی وێنە دەکات لە زمانی شیعرکە بەلادان لە زمانی ئاسایدا دروست دەبێت وەك: (سیمۆنس) دەڵێت: (شیعر وێنەیەکی دوواوە) و ئەندێشەیەك دەخولقێنێ. چونکە لە رێگایەوە شاعیر دەتوانێ دەست بە سەر خوێنەر دابگرێ.

زمانی شیعر زمانی وروژاندنی هەستە [12]. ولایەنی خودی مرۆڤی تیا رەنگ دەداتەوە [13]. زمانێکی ئەندێشەیی و خوازەییە لە سەرووی زمانی ئاساییەوەیە، ئەگەرچی زۆربەی ئەو وشە و زاراوانەی شاعیر بەکاریان دێنێ واژە و زاراوەی ئاساین، بەلام کە شاعیر بە شێوەیەکی سەرنجراکێش و ناوازەدار گیان بەبەر وشەکان دەکات جولە و واتای نوێیان پێ دەبەخشێ. زمانی ئەدەبی لە چاو زمانەکانی تر بە پێچ و پەناترە. لەسەر بناغەی هەردوو چەمکی دەرەکی و ناوەکی دادەمەزرێ [14]:

بناغەی زمانی ئەدەب
- تریەی دەرەکی، پێکهاتە دەنگییەکانە وەك: کێش، سەروا...
- تریەی ناوەکی، کە بنەمایەکی ماناییان هەیە، وەك: خوازە، خواستن...

واتە بە دوو شێوە زمانی ئەدەبی زەق دەکرێتەوە [15].

١- زەقکردنەوەی مۆسیقایی.

٢- زەقکردنەوەی واتایی.

## ٢. واتای فەرهەنگی و واتای مەبەست

مەبەستمان لە واتای فەرهەنگی ئەو واتا بنچینەییە، کە کۆمەڵ بۆ وشەکانی داناوە و لە سەری رێکەوتووە. وەسفی باروودۆخ و شت دەکات و بەشێك واتای رستەی لێ پێکدێت، کە بریتییە لە (واتای وشەکان + کاریگەری ڕێزمانی)، واتایەکی نەگۆڕ و بڵاوە [١٦].

واتای فەرهەنگی وشە بریتییە لە واتای هۆشەکی وشەکە و ئەو واتایەی کە لەگەڵ وشەی تردا دروستی دەکات [١٧]. چونکە وشەکانی دەوروبەری واتای تاکە وشەکە دیار دەکەن [١٨]. جا بۆ لێکدانەوەی واتای هەر وشەیەك دەبێ سەیری ئەو دەوروبەرە بکرێ کە وشەکەی تیا گوتراوە. ئەم جۆرە واتایە پەیوەستە بە سیمای واتاییەکانی کە لە وشەکەدا کۆبۆتەوە وەك:




واتای مەبەست لە دەوروبەر وەردەگیرێت، کە واتاکەی لە دەرەوەی واتای وشە و رستەکانە و باس لە زۆر شت دەکرێت، بەڵام بە ڕاستەوخۆیی دەرنابڕدرێت. بۆیە زانیاری پێشتر گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتنی ئەم جۆرە واتایە [١٩]، چونکە هێماکان بە واتایەکی تر دەردەبڕدرێن. بەمەش دەبێتە (واتای هۆشەکی + واتایەکی زیادە، کە کەسی لێکدەرەوە دەیخاتە سەری)، بۆ لێکدانەوەی ئەمەش دەبێت ڕوو لە بواری (پراگماتیك)بکەین [٢٠].

واتای پراگماتیکی واتایەکی نائاساییە و پابەندی (چالاکی) و (بنەما)یە و پاسا دەبەزێنێ بۆ واتایەکی قووڵتر، تا لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ رستە ناپەسەندەکان بکرێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ دەوروبەری گوتنەکە بگونجێ [٢١]. بۆ نموونە کاتێ دەگوترێ:

*(چەرمی رووی هێندە قایە شمشێری میسری نابڕێ*
*بێ بەکەرشی کەی دەمێنێ تا قیامەت نادڕێ )*
*شێخ رەزا ل/١٣٦*

لێرەدا (شاعیر) مەبەستی مرۆڤی روو قایە. کەواتە، واتای سیمانتیکی بریتییە لە (واتای فەرهەنگی + کاریگەریی ڕێزمانی)، بەڵام واتای پراگماتیکی بریتییە لە (واتای سیمانتیکی + واتای دەوروبەر). کەواتە ئەگەر واتا وەك مەبەست لێکبدەینەوە هەروەك لە شیعردا باوە ئەوا واتای وشە کۆتایی نایێ هەروەك (جاحظ) دەڵێت: باری واتاکان لە شیعر دا جیایە لەگەڵ وشەکان، چونکە ماناکان پەرشو بڵاون [٢٢].

**٤. توانست و چالاکی لە زماندا**

دوو زاراوەی چۆمسکین، زانیاری کەسی دەربارەی زمان دەستنیشان دەکەن.

**توانست:**

ئەو زانیارییە شاراوەیە، کە (قسەکەر) دەربارەی زمانەکەی دەیزانێ و لە ڕێگایەوە دەتوانێ گەیاندن بێنێتە ئاراوە و ژمارەیەکی بێ سنوور ڕستە بەرهەم بێنێ. ڕستە گونجاو و نەگونجاوەکان لەیەك جیابکاتەوە. کە یاساکانی بەکارهێنانی زمان دەگرێتەوە، کە هەر لە منالییەوە لە مێشکیدا تۆمار دەکرێ، سەبارەت بە شاعیر بریتییە لە بەکارهێنانی توانستی زمان بە ناماڵی گەیاندن لە باروودۆخێکی دیار [٢٣]. داهێنان کردن، واتە بەکارهێنانی یاسازمانییەکان لە دەوروبەرێکی نوێدا.

**چالاکی:**

بریتییە لە تێگەیشتنی زمان و کردنەوەی کۆد، کە دەکەوێتە سەر خوێنەر و لێکدانەوەی گونجاوە بۆ ڕستە ناپەسندەکان، تاکو لەگەڵ دەوروبەری گوتنەکە بگونجێ [٢٤] کە لە لێکدانەوەی زمانی شیعردا بەدیدەکرێت.

### ٥. بنەماکانی هاریکاری لای گرایس

بە بۆچوونی (گرایس) بنەمایەکی هاریکاری هەیە لە نێوان ( قسەکەر و گوێگر)، کە ئاخاوتنەکە هەڵدەسووڕێنێ. قسەکران هەوڵدەدەن، کە راست بڵێن و زانیارییەکی وا بدەن تا رادەیەك روون و گونجاو بێت و پێداویستییەکانی گوێگر بێنێتە دی.

بنەمای هاریکاریی نەخشە کێشانێکە بۆ ئەوەی ئاخاوتن شێوەی نموونەیی وەربگرێ. (گرایس)چوار بنەما دەستنیشان دەکات، کە هەر یەکەیان چەند یاسایەکی رەوشتی دەگرێتەوە:

١- چەندێتی: بڕی زانیاری گوتنەکان دەگرێتەوە، کە دەبێ زیاد لە پێویست نەبێ.

٢-چۆنێتی: نابێ گومانت لە راستی گوتنەکانت هەبێ و قسەکانت بێ بەڵگە بن.

٣- گونجان: گوتنەکانت دەبێ گونجاو بێت لەگەڵ پێویستی و داوای گوێگر.

٤- شێواز: گوتنەکەت دەبێ شێوازێکی روون و ئاشکرابێت، واتە، کورت و رێکخراو بێت و تەمومژاوی نەبێت.

پەیڕەوکردنی ئەم بنەمایانە، ئەوە ناگەیەنێ، هەموو کاتێ قسەکران ئەم بنەمایانە رەچاو دەکەن. کاتێ لەم بنەمایانە لادەدەن شێوازێکی کاریگەر دێتە کایەوە. بۆ ئەم مەبەستەش پێویستیمان بە دەوروبەری ئاخاوتنی قسەکەر و گوێگر و بیروباوەڕیان دەبێت[٢٤].

## تەوەرەی دووەم: لادانی واتایی لە زمانی شیعردا

### ١. لادانی واتایـــــــــــی:

(ئۆلمان) وا پێناسەی واتا دەکات، کە بریتییە لە پەیوەندی نێوان (ناو) و (ناولێنراو) هەر گۆڕانێکیش لەو پەیوەندییەدا رووبدات، دەبێتە گۆڕان لە واتا[26] و داهێنانی شاعیریش لە ئەنجامی بەزاندنی یاساکانەوە دێت[27]:

(نێرگـــــس) ← واتای (١) گوڵ ئەو واتایەی کە هەستی پێدەکرێ و لە ژیانی رۆژانە بەکاردێ
(نێرگـــــس) ← واتای (٢) چاو ئەو واتایەی کە شاعیر مەبەستییەتی

وەك:

هەناسەم زولفەکەی لاداو مەیلێکی نەکرد چاوی
نەسیم ئەنگووت و شەو رابرد و نێرگس هەر لە خەو دایە[28].

نالی ل/١١٣

واتە : یار لە خەودابووە و (نالی) بە بای هەناسەی زولفی لەسەر روومەتی لاداوەو، کەچی شەو تێپەڕی بای بەیانی هەڵیکرد (چاو)ی (نێرگس)ی یار هەر لە خەودایە و بەئاگا نەهاتووە. بە باوەڕی (لیچ) لادان ئەو ناستەدەبێ، کە پەیوەندی نێوان قسەکەر و گوێگر نەپچڕێنێ و گوێگر توانای راڤەکردنی هەبێت[29] و لە یاساکانی گۆڕانی واتا لانەدات واتە، یان لە رووی ئەرکەوە لەیەك بچن یان لە رووی روخسارەوە لەیەك بچن، لێرەدا گوڵی (نێرگس) لە شێوە لە (چاو) دەچێت، چونکە گوڵێکە ناوەڕاستەکەی زەردە و پەڕەکانی دەوروبەری سپین. ئەو جیهانە تایبەتییەی کە شیعر خاوەنییەتی، لەسەر بناغەی لادانی واتایی دروست دەبێ و هەڵەکان لە ژێر هۆکاری دەروونی دان.

(یاكۆبسن) پێوایە شێوەی هەڵبژاردنی وشەیەك لە نێو كۆمەڵێك وشەی، هاوواتا و لەسەر تەوەرەی جێنشینی چۆنیەتی لە پەنایەكدادانی ئەو وشانە لە تەوەرەی هاونشینی، دەكرێ رستەیەك لە ئەركی پەیوەندییەوە بگوازێتەوە بۆ ئەركی ئەدەبی. زمان بە شێوەی زنجیرە ئاخاوتن لەسەر هێڵێكی راستەوخۆ لە دوو تەوەرە خۆی دەنوێنی[٣٠]:

**١- تەوەرەی جێنشینی:**

بریتییە لە پەیوەندیی نێوان وشە پێكهێنەرەكانی رستە لەگەڵ وشە نادیار و لەبەردەست نەبووەكانی نێو رستە.

**٢- تەوەرەی هاونشینی:**

بریتییە لە پەیوەندیی نێوان وشە دیار و لەبەردەستەكانی نێو رستە. واتە، پەیوەندیی واتایی ئاسۆیی لە نێوان وشەكانی چەند پۆلێكی رێزمانیی جیاواز. هەر كاتێك پەیوەندییەكەش بپچڕێ، ئەوا ناتاسایی و لادانی واتایی دێتە كایەوە.

زمانی شیعر لە ئاستی (پراگماتیك)دا لێكدەدرێتەوە، چونكە پەیوەندیی هێما بە كەسی لێكدەرەوە لێكدەدرێتەوە [٣١] و مەبەستی شاعیر لە شیعردا لە رێگای چەند هێمایەكەوە دەردەبردرێ [٣٢] گوێگریش لە روانگەی شاعیر و دەوروبەرە زمانییەكە هێماكان لێكدەداتەوە.




واتە شاعیرەكە چۆنی بەكاربهێنێ و ئەو جۆرە واتایە دەدات هەربۆیەش دەڵێن (واتا لە دڵی شاعیردایە).

## ٢. لادانی واتایی لە زمانی شیعردا

شاعیر سەرلەنوێ زمان دروست دەکاتەوە لۆجیکی ئەو زمانە جیایە لە لۆجیکی زمانی ناسایی توانایەکی رۆحی بە وشە دەدات [٣٣] لە ڕێگای ئەم لادانانە:

### ١- لادان لە چەندێتی:

ئەگەر بەشداری (شاعیر) زیاد لە پێویست بێت، ئەوا ئەم لادانە لە ئەزانینەوە نییە، بەڵکو بۆ مەبەستێکی قووڵتر ئەم لادانەی بەکارهێناوە، تاکو شێوازێکی کاریگەر بخولقێنێ وەك:

*پووش لەلای حەلوایە حەتاکو پەلۆشەی چنگ کەوێ*

*بای ئەدا لوولی ئەدا قورتی ئەدا مانەندی حووت*

*شێخ رەزا /ل١٢٨*

لێرەدا شاعیر دەیتوانێ بە دێرێك بڵێت: ئێستەرەکە برسی بوو.

### ٢- لادان لە چۆنیەتی:

قسەی ناڕاست و بێ بەڵگە دەگرێتەوە، کە لە گەڵ واقعدا ناگونجێ و بە چەند شێوەیەك دەبێت:

#### أ- گاڵتەکردن:

*ئاخ لە دەس شۆربای سلێمان چاووش و قاوەی خلە*

*ئەو دەڵێی __ناوی گەراوە__ و ئەم دەڵێی __ئەموتی گلە__*

*شێخ رەزا /ل١٣٥*

لێرەدا شاعیر گاڵتە بە (شۆربای سلێمان چاووش) و (قاوەی خلە) دەکات و بە (ناوی گەراو) و (ئەموتی گل) دەچوێنێ، کە ئەگونجاون لەگەڵ واقعدا.

**ب- خواستن:**

خواستن لادانە لە یاسای زمان، لە پاڵ هەست و سۆزی شاعیرەوە دەردەبردرێت:

*لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان*

*بەیانیدا سێوەی باغی سێوان*

*نالی/ ٧٩*

لێرەدا شاعیر (سێو)ی خواستووە بۆ ((مەمك) کە لە شێوەی خری لەیەك دەچن و (دوگمەی سینە)ش نیشانەیە بۆ ئەم خواستنە.

**ج- ئاماژە پێ کردن:**

کە درکە دەگرێتەوە و ئاماژەیە بۆ شتێك یا کەسێك ...............

نەخلی باڵات نەوبەرەیە، تازە شکۆفەی کردووە

*تۆ کە ( بۆی شیرت لە دەم دێ)، ئەم مەمەت کەی کردووە*

*نالی ل/ ٣٦*

(بۆی شیرت لە دەم دێ)، ئاماژەیە بۆ ( منالی) کەسەکە.

**د- کەمکردنەوە:**

کاتێ یەکێ کارێکی گەورەی بکات و بەرامبەری بچووکی بکاتەوە. وەك:

*ئەبو زەیدی دەکا ڕۆحم لەگەڵ حاجی دەمت، ئەما*

*دەترسێم وەك نیشانم دا بلێ هیچە و پەشیمانم*

*حاجی قادر ل/ ١١٩*

واتا: گیانم وەکو (ئەبوو زەید)[٢١] بۆ حاجی دەمت دەپاڕایەوە، لەوە دەترسێم کە گیانم نیشانی یاردا لە بری حاجەکەی بلێ بێنرخە و هیچە. لێرەدا شاعیر وا نیشان دەدا کارێکی گەورەی کردووە، کەچی بەرامبەرەکەی کەمی دەکاتەوە.

**هـ- زیادەڕۆیی:**

ئەوەیە، کە قسەکردنەکە هەڵئاوسانی واتایی تێدا بێت وشەی هاوواتا و زیادی تیا بەکار هاتبێت، وەك:

*ئەی تەلەقی گفت و گۆ، جامیعی کیزب و درۆ،*

واعیزییە نیشی تۆ ، عاشقییە کاری من

نالی /ل٨٤

لەم دێرەدا زیادەڕۆیی هەیە، چونکە باسی لە دوو وشە کراوە (کیزب) و (درۆ)، کە هاوواتان.

یان هەندێ جار زیادەڕۆیی لە قسەکردنەکاندا هەبێت. وەك:

*بە تەحریکی تەلێکی سەد هەزار نەفسی بە کوشتن دا،*

*رەئیسی حیلەکاران شای قومارباز انە، ئەم ریشە*

*شێخ رەزا /ل١٣٤*

ئەم دێرە زیادەڕۆییەکی زۆری تێدایە، چونکە بە جووڵانەوەی تەلە ریشێك چۆن سەد هەزار کەس بە کوشتن دەچێ ؟

### ٣- لادان لە گونجان:

ئەوەیە، کە قسە کردنەکە نەگونجێ لەگەڵ واقع. وەك:

*هەوری خەفەتە بەفری غەمی داوە بەسەرما*

*یا سەرسەری توورینە کە لێی کردمە سەرما*

*حەریق/ل١٤٤*

لەم دێرە شیعرە (خەفەت) ناشێ (هەور)ی هەبێ و(غەم) یش (بەفر)ی نابێ و ناشێوانێ بەسەریدا بدرێ.

یان هەندێ جار دوو شتی دژیەك کۆدەکرێتەوە، وەك:

*یارم لە تەندەروون هات دەستی رەقیب لە دەستا*

*غەمناك و شادمانم رەحمەت عەزابی هێنا*

*سالم/ل٥٨*

(غەمناك) و (شادمان) و (رەحمەت) و (عەزاب) شتی دژیەکن و لەگەڵ یەکدا کۆنابنەوە.

## ٤- لادان له شێوان

واته قسەکردنەکە بە شێوازێکی لێڵ دەربڕێ، وەك لە بەکارهێنانی وشەی فرەواتا و هاوبێژ، کە لە رەوانبێژیدا لە ژێر ناوی (رەگەزدۆزی) بەکاردێت، وەك:

*خەتات فەرمووی کە خۆشە چین و ماچین*

*کە ناچین لێرە ، خۆشە چینی ماچین*

*نالی /ل٢١*

وشەی ( خۆشە) لەم دێرە شیعرەدا هاوبێژە و بە دوو واتا دێت (خۆشی) کە بەرامبەرەکەی ناخۆشییە و (هێشو)[٣٥].

یان :

*عەبەس کوردی مەلائێك دێن دەپرسن مەزهەب و دینت*

که (قادر) خۆی دەزانێ، لەسەر کام مەزهەب و دینم

کوردی /ل١٠١

لێرەدا وشەی (قادر) جۆرە لێڵییەکی تێدایە نازانرێ ئاخۆ مەبەستی شاعیر (قادر)ی تەریقەیە، کە سالم خۆی لەسەری بووە، یان (شێخ عبدالقادری گەیلانی) یە ، یان (خوایە) یان ئەو (قالە)یە، کە لە شیعرەکانیدا باسی دەکات[٣٦].

## ئەنجام:

١. داهێنان تایبەتییەکی زمانەو لە زمانی شیعردا زیاتر بەرجەستە دەبێت، کە داهێنانێکی پێکهاتەی دەروونی تاکە کەسییە و هەست و سۆزی تیا رەنگ دەداتەوە.

٢. زمانی شیعر زمانێکی خوازەیی و دورستکراوە و لە سەرووی زمانی ناسایەوەیە و شاعیران بۆ وروووژاندن و بزواندنی هەست بە شێوەیەکی ناناسایی مامەڵە لەگەڵ وشەدا دەکەن و دوو شت زەقدەکرێتەوە: (مۆسیقا) و (واتا).

٣. لە زمانی شیعر پەیوەندی ئاسایی نێوان (ناو-ناولێنراو) دەپچڕێ و بەمەش لە پێوانەی ئاسایی زمان دەردەچێ و شتێك دەگوترێ و مەبەست شتێکی ترە.

٤. لادانی واتایی دیاردەیەکی زەقە لە زمانی شیعردا لە بێ ئاگایی نییە، بەڵکو بۆ مەبەستێکی قووڵ و سەرنجڕاکێشان و رازاندنەوە بەکاردێت.

٥. لێکدانەوەی زمانی شعر لە ئاستی پراگماتیکدا دەبێ و پێویستی بە چالاکییە تاکو داهێنان و لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ رستە ناپەسندەکان بێتە ئاراوە.

٦. شیعر فرەواتایە و لێکدانەوەی بە نزیکراوەیی دەبێت، چونکە دوورە لە دەوروبەری ئاخاوتن.

## پەراوێزەکان

(١) اسماعیل ملحم: ٢٠٠٣: ٩.

(٢) نوال محمد عطیە: ١٩٧٥: ٢١.

(٣) میشال زکریا: ١٩٨٣: ٣٠.

(٤) اسماعیل ملحم: ٢٠٠٣: ٩.

(٥) خلیل ابراهیم العطیە: ١٩٨٦: ٢٠.

(٦) شکری محمد عیاد: ١٩٨٨: ٧٢.

(٧) محمد رچا شفیعی کدکنی: ١٣٧٨: ٩.

(٨) د.صلاح فضل: ١٩٨٧: ٣٧٨.
(٩) احمد امين: النقد الادبي: ١٩٨٣: ٥٧.
(١٠) عەبدولخالق يەعقوبى: ٢٠٠١: ٣٦.
(١١) ديل كارنجى: د.ت: ١٨٣.
(١٢) ميديا: ١٩٩٨: ١٧٨.
(١٣) مصطفى مندور: ١٩٧٤: ١٨٣.
(١٤) عەبدولخالق يەعقوبى: ٢٠٠١: ٢٧.
(١٥) نور الهدى لوشن: ١٩٩٥: ٨٣.
(١٦) جوليا اس فالك: ١٣٧٧: ٣٥٧.

(17) Jean Aitichison:1993:81
(18) Ellis:1970:81

(١٩) جمعه سيد يوسف: ١٩٩٠: ٢٠.

(20)Leach: 1996:5.
(21)DianeLarsen،Freeman:1980:77

(٢٢) ابى اسحاق القيرواني: ١٩٩٦: ١٢.
(٢٣) ميشال زكريا: ١٩٨٣: ٢٦١.

(24)DianeLarsen،Freeman:1980:77

(٢٥) اف.ار.بالمر: ١٩٨١: ٢٠٠.
(٢٦) ستيفن نولمان:١٩٧٢: ١١٢.
(٢٧) حاتم صطر:١٩٨٨: ٧.
(٢٨) مارف خەزنەدار: ١٩٧٧: ١١٣.
(٢٩)محمد معروف فتاح: باسيكى بلاونەكراوە: ٢٧.
(٣٠) عبدالقادر هنى: ١٩٩٧: ٢٤٠.
(٣١) ا.ب.فولكس:١٩٨٦: ٣٤.

(٣٢) محمد عزام:١٩٩٤: ١٥٤.

(٣٣) خانزاد علي قادر: ٢٠٠٤: ٢٤.

(٣٤) ئەبوو زەید پالەوانی مەقاماتی حەریریە و بۆ سوالکردن بە شیعر دەپاڕایەوە.

(٣٥) بڕوانە: (علاءالدین سجادی)، خۆشخوانی ١٩٨٦ ل: ١٢٧.

(٣٦) ابراهیم احمد شوان: ١٩٩٩: ٩٤.

## سەرچاوەکان:


A. بەکوردی:

١. ئەورەحمانی حاجی مارف، (١٩٧٥) وشەی زمانی کوردی، بەغدا.

٢. ئەورەحمانی حاجی مارف، (١٩٨٦) چەند کێشەیەکی زمانناسی، گ، کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد، بەرگی (١٥) بەغدا.

٣. بێخاڵ عبداللە سعید (١٩٨٩) واتاسازی وشە، نامەی ماجستێر، کۆلیجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

٤. سەلام ناوخۆش (٢٠٠٥) پوختەیەك دەربارەی زمانناسی (مێژوویی. بونیاتگەری. چۆمسکی)، هەولێر.

٥. سەلام ناوخۆش(٢٠٠٥) پوختەیەك دەربارەی زمانناسی، چاپی یەکەم هەولێر.

٦. شێخ محمدی خاڵ (١٩٥٧) پەندی پێشینان، بەغدا.

٧. ڤیان سلیمان حاجی (٢٠٠١) ڕێکەوتن لە شێوەی ژووررووی زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

٨. عبداللە عزیز محمد (١٩٩٠) گۆڕانی واتای وشە لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

٩. عەبدولخالق یەعقوبی(٢٠٠١)، ئەرکی ئەدەبی زمان لە شعری کلاسیکی کوردیدا، رامان، ژ:٥٧، هەولێر.

١٠. عزالدین مصطفی رسول (١٩٧٩) لێکۆلینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ب:٢ بەغدا.
١١. علاءالدین سجادی(١٩٨٦) خۆشخوانی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین.
١٢. کلودجرمان وریمون روبلان، (٢٠٠٦)، واتاسازی، وەرگێرانی، یوسف شریف سعید چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.
١٣. محەمەد مەحوی (٢٠٠١)، زمان و زانستی زمان، سەرەتایەك بۆ زانستی زمان، بەرگی یەکەم، دەزگای پەخش و چاپی سەردەم، سلێمانی.
١٤. محەمەد معروف فتاح (١٩٨٥) شێوازی ناخاوتن لە ناو نافرەتی سلێمانیدا، رۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٧) بەغدا.
١٥. محەمەد معروف فتاح (١٩٨٦) سنوور و بنەما و شەرکەکانی کۆزمانەوانی، گ.رۆشنبیری نوێ، ژ(١١٢) بەغدا.
١٦. محمد معروف فتاح، (١٩٩٠) زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.
١٧. محەمەد معروف فتاح، (١٩٨٥)، شێوازی ناخاوتن لە ناو نافرەتی سلێمانیدا، رۆشنبیری نوێ، ژ/١٠٧، بەغدا.
١٨. محمد معروف فتاح، (١٩٨٥)، هێماکاری و زمانەوانی، گ/کاروان، ژ/٢٨، هەولێر.
١٩. محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٨٦)، دیسان ئیدیەم، پێداچوونەوەی لەبەر رۆشنایی زمانەوانی دا. گ.کۆری زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەرگی (١٥) بەغدا.
٢٠. محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٩٠) زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.
٢١. محەمەد مەعروف فەتاح (١٩٩٢) باس لە جۆرێك لە رستە، گ. رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٨)، بەغدا.
٢٢. میدیا (١٩٩٨) سەرەتایەکی زمانناسی ، بەرگی یەکەم، سلێمانی.

٢٣. وريا عمر امين (١٩٩٥) لێلی له رێزماندا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژماره ١٣٦.

٢٤. یۆئێل یوسف عەزیز & سلمان داود ئەلواستی & عەبدولوەهاب ئەلنەجم، (١٩٨٤) وەرگێرانی ئەدەبی، وەرگێرانی: غازی فاتح وەیس، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر.

### B. به عەرەبی

سەرچاوەکان:

١. أ.ب. فولكيس، (١٩٨٦ )، الأدب والدعاية. ترجمة: موفق الحمداني، دار الشؤون الثقافية، بغداد.

٢. ابن رشيق (١٩٧٢) العمدة، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد، ج/١،ط/٤،دار الجيل، بيروت، لبنان.

٣. ابى اسحاق ابراهيم الحصرى القيروانى(١٩٩٦) على محمد البجادى ط/٢، دار الفكر العربى، دمشق، زهر الاداب وثمر الالباب.

٤. ابى الفرج قدامة بن جعفر، (١٩٦٣)، نقد الشعر، تحقيق كمال مصطفى، مكتبة خانضى، مصر، المثنى بغداد.

٥. احمد امين (١٩٨٣) النقد الادبى، مكتبة النهضة المصرية، ط/٥ القاهرة.

٦. احمد مختار عمر(١٩٨٢) علم الدلالة، ط/١ مؤسسة الفليح للطباعة والنشر، النقرة، الكويت.

٧. اسماعيل ملحم (٢٠٠٣) التجربة الابداعية، دراسة فى سيكولوجية الاتصال و البداع، منشورات اتحاد كتاب العرب، دمشق.

٨. اف.ار.بالمر(١٩٨٥) علم الدلالة: ترجمة: مجاشطة، مطبعة العمال المركزية، بغداد.

٩. بير جيرو، (١٩٩٢) علم الدلالة، ترجمة، منذر عياشي، ط/١ دمشق.

١٠. تيرينس موور و كريستين كارانغ (١٩٩٨) فهم اللغة نحو علم اللغة لما بعد ضومسكي ت/حامد حسين الحجاج، دار الشؤن الثقافية و العلمية، بغداد.
١١. جان كوهن، (١٩٨٦) بنية اللغة الشعرية، ت/، محمد الوالي و محمد العمري، دار البيضاء، المغرب.
١٢. جمال رشيد& فوزي رشيد (١٩٩٠) تاريخ الكرد القديم، جامعة صلاحالدين. اربيل.
١٣. جمعة سيد يوسف، (١٩٩٠) سيكولوجية اللغة والمرض والعقلي، سلسلة عالم المعرفة، سلسلة (١٤٥)، الكويت.
١٤. جودث جرين (١٩٩٣) علم اللغة النفسي تشومسكي وعلم النفس ترجمة: د. مصطفى التوني، الهيئة المصرية العامة للكتاب.
١٥. جون لاينز، (١٩٦٨) علم الدلالة، ترجمة: مجيد الحليم الماشطة، حليم حسين فالح، كاظم حسين باقر، بصرة.
١٦. جون لاينز، (١٩٨٧) اللغة والمعنى والسياق، ترجمة: عباس صادق الوهاب، بغداد.
١٧. حاتم صالح الضامن، (١٩٨٩) علم اللغة ،بغداد.
١٨. حاتم صكر، (١٩٨٨) الشعر العربي عند نهايات القرن العشرين، تحديث النقد الشعري دار الحرية للطباعة بغداد.
١٩. حاكم مالك لعيبي (١٩٨٠) الترادف في اللغة ـــــبغداد
٢٠. خليل ابراهيم العطية، (١٩٨٦) التركيب اللغوي لشعر السياب، دار الشؤن الثقافية العامة.
٢١. داود عبدة، (١٩٨٤) دراسات في علم اللغة النفسي، ط/١،كويت.
٢٢. ديل كارنجي، (د.ت )، التأثير في الجماهير عن طريق الخطابة، ترجمة: رمزي عيسى و عزت فهيم صالح، دار الفكر العربي..

٢٣. رمضان عبدالتواب (١٩٨٢) مدخل الى علم اللغة و مناهج البحث الغوى، ط:١، القاهرة.
٢٤. ستيفن اولمان، (١٩٨٦) دور الكلمة في اللغة، ترجمة: كمال محمد بشير، مكتبة شباب. بغداد.
٢٥. شكري محمد عياد، (١٩٨٨)، اللغة الأبداع، مبادي علم الاسلوب العربي، ط/١.
٢٦. صلاح فضل، (١٩٨٧) نضريات البنائية في النقد الادبي، ط/٣، بغداد.
٢٧. صلاح فضل، (١٩٨٥) علم الاسلوب مبادئه واجراءاته، دار الآفاق الجديدة، بيروت.
٢٨. عادل فاخوري، (١٩٨٩) اقتضاء في التداول اللساني، مجلة عالم الفكر، مجلد (٢٠)، عدد/ ٣ ج/٧ كويت.
٢٩. عبدالحميد حسن الالفاظ اللغوية خصائصها و انواعها.
٣٠. عبدالقادر هني، (١٩٩٧) اللسانيات البنيوية في مطلع القرن العشرين، فردينان دي سوسير نموذجا، مجلة، اللغة الأدب، العدد(١١) الجزائر ص٢١٨.
٣١. عزمي اسلام، (١٩٨٥) مفهوم المعنى دراسة تحليلية، حوليات كلية الأداب، الحولية السادسة، جامعة الكويت.
٣٢. كلود جرمان وريمون روبلان، (١٩٩٤) ترجمة: نورالهدى لوشن، دار الفاضل، دمشق.
٣٣. م.م.لويس (١٩٥٩) اللغة فى المجتمع، ت، تمام حسان، دار احياء الكتب العربية
٣٤. محمد الصادق العفيفى (١٩٧٨) النقد التطبيقى والموازنات، مؤسسة الخانجى، مصر.
٣٥. محمد عزام، (١٩٩٤) التحليل الألسني للأدب، دمشق.
٣٦. محمد علي الخولي، (١٩٩١) معجم علم اللغة النظري، (انكليزي-عربي)، بيروت، لبنان.
٣٧. محمد محمد يونس علي، (١٩٩٣) وصف اللغة العربية دلاليا، جامعة فاتح، ليبيا.

٣٨. مصطفى فهمي (د.ت) مجالات علم النفس، دار المصر للطباعة، المصر.
٣٩. منقور عبدا لجليل، (٢٠٠١) علم الدلالة، أصوله ومباحثه في التراث العربي، دمشق.
٤٠. موفق الحمداني، (١٩٨٢) اللغة وعلم النفس، بغداد.
٤١. ميشال زكريا، (١٩٨٠) الالسنية علم اللغة الحديث، المبادئ والاعلام، بيروت.
٤٢. ميلكا افيتش، (١٩٩٦) اتجاهات البحث اللساني ت، سيد عبدالعزيز مصلوبة & وفاء كامل فايد، بغداد.
٤٣. نعوم جومسكي، (١٩٨٥)، جوانب من النظرية النحو، ترجمة: مرتضى جواد باقر، موصل.
٤٤. نوال كريم زرزوور (١٩٨٩) ابن جني وعلم الدلالة، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة المستنصرية.
٤٥. نوال محمد عطية (١٩٧٣) علم النفس اللغوي، ط/١، مكتبة انجلو المصرية.
٤٦. نورالهدى لوشن، (١٩٩٥) علم الدلالة، دراسة وتطبيقاً، ط/١، بنغازي، ليبيا.
٤٧. هدسون، (١٩٨٧)علم اللغة الاجتماعي، ترجمة: محمود عبدالغني عياد، مراجعة وتقديم عبدالامير الاعسم، بغداد.
٤٨. وفاء محمد كامل، (١٩٩٧) البنيوية في اللسانيات، مجلة عالم الفكر، مجلد، (٢٦) العدد(٢٢) ص٢٣٦-٢٣٧ كويت.
٤٩. يحيى احمد، (١٩٨٩)، الاتجاه الوظيفي ودوره في تحليل اللغة، مجلة عالم الفكر، مجلد (٢٠) عدد/٣، كويت.

C. به فارسی:

١. جوليا.أس.فالك (١٣٧٧) زبان شناسي و زبان، بررسي مفاهيم بنيادي زبان شناسي، ت/ خسرو غلاميلي زادة ض/،٥تهران.
٢. محمد رچا شفيع كدكني ، صور خيال در شعر فارسي، چاپ هفتم، نشرآگه، تهران، ١٣٧٨ (١٩٩٩).

## D. بە ئینگلیزی


1. Adrian, Akmajian, RICHARD. A. demers. Robert. M. harnich, (1984) "Linguistics An Introduction to Language and Communication" The MIT press, Cambridge, London 2nd Edition
2. Ausitin, L.(1972) Performative-Contrastive Oxford. Univ Press
3. Chomsky Noman (1965) Aspects of the theory of syntax ، Cambridge mass. the mit press
4. Crystal, D.(1991) A Dictionary of Linguistics and Ponnetics،Cambredge
5. Diane Larsen, Freeman (1980). "(Discourse Analysis in Second Language, Research" new bury House U.S.A.
6. Ellis, J. (1970) "On Contextual Meaning" in Bazell, C, E etal (Eds) in Memory of J.R. Firth Longman.
7. Finch.G.(1998):How to study linguitics, London
8. Formkin&Roman,) 1983(, An-Introduction to Language, Therd edn, Holt Saunders, international Editions.
9. Fowler, R, (1981), An Introduction to the transformational syntax, 4th, edition, Rontledge and Kegan Paul, Ltd. London.
10. Fromkin, V, and Roman, R. (1983) "An-Introduction to Language" Therd edn. Holt Saunders ،international Editions.
11. Harthman, R, R.and Stor, F, C. (1976), Dictionary of Language and Linguistics, London.

12. Jean Aitichison, (1993) "Linguistics" Great Britain, Hodder dstonghton
13. JeanStilweell peccei (1999) "Pragmatics" London.
14. Jerrold J. Katz, Jerry A. Fodor The Structure of a Semantic Theory Language, Vol. 39 ،No. 2 (Apr. - Jun. ،1963), pp. 170-210.
15. Leech, G. (1996) "Principles of Pragmatics" London Longman.
16. Leech. G. (1975) "Semantics" Great Briton, London.
17. Levinson, S.C.(1997)"Pragmatics" Cambridge. University press
18. Levinson, S.C.(1997)"Pragmatics" Cambridge. University press.
19. Lyons J (1968) "Introduction to Theoretical Linguistics" Cambridge University, press, London and New York
20. Lyons J (1977) "Introduction to Theoretical Linguistics" Cambridge University, press ،London and New York
21. Palmer F.R.(1981) "Semantics" Cambridge University, press Cambridge.
22. Pier Guiraud (1964) la Semantiqus, presses Universitaires De France paris.
23. Trask, R, L.(1998) A Dictionary of Gramatical Termms in Linguistics, London

## سەرچاوەکانی کە نموونەکانم لێوەرگرتوون:


١. مارف خەزنەدار، (١٩٧٧) دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، بەغدا.

٢. محمد نوری عارف، (١٩٨١) تێکستی ئەدەبی کوردی (هۆنراوە)، ب/١ سلێمانی.


## ڕۆژنامەکانی کە نموونەم لێوەرگرتوون:


١. (یەکگرتوو) (ژ/٢٧٣) لە (٢٠٠٠/١/٢٨).

٢. (برایەتی) (ژ/ ٣٠٩٩) لە (٢٠٠٠/٥/٢٨).

٣. (برایەتی) (ژ/٣١٨٣) لە (٢٠٠٠/٩/١٦).

٤. (میدیا) (ژ/١٠١) لە (٢٠٠١/٨/١).

٥. (میدیا) (ژ/٩٥) لە (٢٠٠١/٥/١٦).

٦. (دەنگی میللەت) (ژ/١٥٣) لە (٢٠٠٣/٣/١).

٧. (باسەرە) (ژ/٢٨) لە (٥ ت٢ ٢٠٠٣).

٨. (جەماوەر) (ژ/٥٣) لە (٢٠٠٣/١١/٣).

٩. (ئەمرز) (ژ/٢٩) لە (٢٠٠٣/٨/٢٠).

١٠. (باسەرە) (ژ/٢٠) لە (٢٠٠٣/٩/١٠).

١١. (خەبات) (ژ/١٤٣٥) لە (٢٠٠٤/٥/١٢).